عەلی باپیر



# چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ

## لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا

75

پرۆژەی تیشک





# چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ

# لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا

## عەلی باپیر

چاپی یەکەم



﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ
ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم
بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣ الأنعام﴾

# پێشـــکەش بێ

بەهەموو ئەوانەی دڵسۆزانەو هۆشیارانەو بوێرانە کاردەکـەن لــە پێنـــاوی بەختـــەوەرکردنی دنیـــاو ســـەرفرازکردنی دوارۆژی کۆمەڵگاکەیاندا، بەهۆی چاکتر لێتێگەیشتنو باشــتر پێوەپابەنـد بوونی شەریعەتی بـێ هەڵــەو پەڵــەی خــوای کاربــەجێو زیــاتر پێکەوە ئاوێتە بوونی ژینو دینیانەوە.

# پێشەكی

**الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وآله المهتدين بهداه**

**خوێنەری بەڕێز!**

ئەم كتێبەی بەردەستت بریتیە لە كۆی چوار بابەتی سیاسی گرنگ كە لە ڕۆژگاری ئێستاماندا باسو خواس مشتومڕی گەرمیان لەبارەوە دەكرێ، كە بریتین لە:

1- تەبایىو پێكەوە ژیان.
2- هاوپەیمانێتی .
3- بەشداریی كردن لە پەرلەماندا.
4- بەشداریی كردن لە حكومەتدا.

شایانی باسیشە هەركام لەم چوار بابەتە یەكی لە دوو ئاڵقەی بەرنامەی(سەرنج)دا لە كەناڵی ئاسمانیی پەیام پێشكەش كراون - جگە لە (هاوپەیمانێتی) كە تەنیا ئاڵقەیەكی بۆ تەرخان كرابوو - ئنجا پاش هێنرانە سەر كاغەزو چاپیدا گێرانەوەی خۆم، بەم شێوەیەی لێهاتوە.

جا هەرچەندە من هەوڵم داوە كە هەركام لەو بابەتانە لە مەحەكی عەقڵوشەرع بدەمو بەپوختیو گوشراویی ئەوەی بەرێكو راستو بێ گرێو گۆڵی دەزانم لەبارەیەوە بیلێم، بەڵام بێگومان ناڵێم هەرچی پێویست بووە

بگوترێ لەبارەی هەرکامیانەوە توانیومە بیخەمە دوو توێی ئەم کتێبەوە، چونکە هەرکام لەم بابەتانە هەڵدەگرێ کتێبو لێکۆڵینەوەی سەربەخۆو تایبەتی لەبارەوە بنووسرێ، بەڵام وەك گوتراوە: (مالایدرك كُلُّه لایترك بَعْضُهَ) ئەوەی هەموویشی جێبەجێ ناکرێ، واز لەهەندێکیشی ناهێنرێ.

هیواداریشم ئەم بڕە توێژینەوەیە پوختو گوشراوە بەتەواوی نیشانەی خۆی بپێکێو بەرچاوی تەماوی گەلێك کەس ڕۆشن بکاتەوە سەبارەت بەهەڵوێستی ڕاستو ڕێكو شەرعییانەو ژیرانە، لەبەرانبەر هەرکام لەو چوار بابەتە هەستیارو گرنگەدا، کە وەك پێشتر ئاماژەم پێدا لەم ڕۆژگارەدا چ لە کۆمەڵگای خۆمانو چ لە سەرجەم کۆمەڵگایەکانی دیکەی مسوڵمانادا قسەو باسو بگرەو بەردەی زۆریان لەبارەوە دەکرێو گەلێك جاران بەو هۆیەشەوە مسوڵمانانو تەوژمی ئیسلامیی دووچاری کێشەو گرفتو دووبەرەکی بوون!

هەڵبەتە کێشمەکێش کردنو شەڕەقسەو بگرەو بەردەی مسوڵمانانیش لەوبابەتو مەسەلانەدا کە وەحی نوختەی تێدا نەخستوونە سەرپێتو جێگای ئیجتهادو ڕاجیاییان تێدایە، بە تایبەت لەبواری حوکمو سیاسەتدا کەبابەتێکی هەرەگرنگو زیندووی بواری هەڵسو کەوتو عادەتەکان (المعاملات والعادات)ە، کە بناغە تێیاندا ڕەوایی (إِباحة) وەدەستکراوەییە، شتێکی ئاساییو چاوەڕوانکراوە، بەڵام ئەوەی کە نائاساییو نەگونجاوو لە مسوڵمانان ناوەشێتەوە، ئەوەیە کە کێشەو تێکگیرانو مشتومڕەکانیان نەگێڕنەوە بۆتەرازووی شەریعەت، کە لە عەقڵی سەلیمو وەحی ڕاستدا خۆی دەنوێنێ، لە حاڵێکدا کە خوای زانا

شارەزا بەوە فەرمانی پێكردوون، وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ (١٠)﴾ الشورى

واتە: وە لە هەرشتێكدا كەوتنە ڕاجیاییەوە ئەوە دادوەریی تێداكردنی بۆلای خوایە، ئائەو خوایەتان پەروەردگارمە پشت هەر بەو دەبەستمو تەنیا بۆلای ویش دەگەرێمەوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿... فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٥٩)﴾ النساء

واتە: ... وە هەركات لەشتێكدا كەوتنە ناكۆكییەوە بیگێڕنەوە لای خواو پێغەمبەر، ئەگەر بڕواتان بەخواو ڕۆژی دوایی هێناوە، ئەوە باشترەو سەرەنجامیشی چاكترە.

خواش بەبەزەییو كەڕەمی بێ سنووری خۆی یارمەتیو هیدایەتی هەموولایەكمان بدات كە بەبێ بەرچاوڕوونی هەنگاو نەنێینو، هەركات كەوتینە ڕاجیاییو كێشەو مڕیشەوە گەڕانەوەمان بۆلای قورئانو سوننەتو كێشانو هەڵسەنگاندنی ڕاجیاییەكانمان بەتەرازووی شەریعەت لەسەرشان سووكو ئاسان بێو، پاشان دەست هەڵگرتنیشمان لەو قەناعەتو بیروڕایانەی كە بۆمان دەردەكەوێ هەڵەن، پێ وەك ئاو خواردنەوە وابێ، چونكە بێگومان دان بەهەڵەی خۆدا هێنان چاكەیە (الأعتراف بالخطأ فضيلة)، وە دان بەهەڵەدا هێنانو زوو دەستبەردار بوونی، باجو مەسرەفی یەكجار كەمە!

دیارە هەرچی لەم كتێبەو سەرجەم كتێبو بەرهەمەكانی دیكەشمدا گوتوومەو دەیڵێم، جگە لەو شتانەی كە ڕاستە مانای ئایەتو

فەرموودەکانی پێغەمبەرن ﷺ، بریتین لە بۆچوونو تێگەیشتنی بەندەو ئێستا بەڕاستو دروستیان دەزانم، یان بەڕاستتریان دەزانمو، سوپاسی هەر بەرێزێك دەکەم کە بەبەڵگە بۆم بسەلمێنێ بەهەڵەدا چووموو خوا پشتیوان بێ بەسینگ فراوانیو ئاسانییەوە لێی وەردەگرمو عەقڵو زانیاریی خۆمیان پێ دەوڵەمەندو بەهرەمەند دەکەم.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهدأن لاالله الاّأنت، أستغفرك وأتوب اليك

هەولێر
15ی رەبیعی دووەمی 1431ی کۆچی
31 ی مایسی 2010ی زایینی

ameer.maktab@yahoo.com


/AliBapir

/AliBapir

/MediaAmeerOffice
www.alibapir.net

# ڕێ خۆشکردن

بەڕێزان!

ئەم بابەتەی بەردەستتان بریتیە لە کۆی دوو ئاڵقەی بەرنامەی سەرنجی کەناڵی ئاسمانیی پەیام، کە وتووێژو پرسیارو وەڵامی نێوان کاک عومەر گوڵپیو بەندەن لەمەڕ: (تەبایی و پێکەوە ژیان)ەوەو پاش هێنرانە سەر کاغەزو[1] چاوپێداگێڕانەوەو پێداچوونەوەی خۆم، بەم شێوەیەی لێهاتوە.

هیواداریشم ئەم وتووێژو لێکۆڵینەوەیە مایەی بەرچاو ڕوونبوونەوەو زیاتر شارەزابوون بێ، بەسینگ فراوانیی و لێبوردەییو تەبایی ئیسلامو مسوڵمانانێك کەپێوەی پابەند دەبن، لەگەڵ نامسوڵمانانێکدا کە ئامادەیی پێکەوە ژیانو تەباییان لەگەڵیاندا هەیە.

چونکە بەداخەوە لەم ڕۆژگارەماندا لەلایەن کەسانێکی زۆرەوە لە مسوڵمانانو نامسوڵمانان، سەرگەردانیی و چەواشەبوونێکی زۆر هەیە لەبارەی تێڕوانینو هەڵوێستی ئیسلامەوە بەرانبەر بە مەسەلەی پێکەوە ژیانو یەکدی تەحەممولکردنو پێکەوە هەڵکردنی پێکهاتەکانی کۆمەڵگا بە مسوڵمانو نا مسوڵمانەوە، کە پێم وایە ئەوەش بەگشتی سێ هۆکاری سەرەکی هەن:

1- نەزانیی و نەشارەزایی بەرانبەر بە ئیسلامی بەرجەستە لەقوڕئانو سوننەتدا (کە دیارە جگە لەقوڕئانو سوننەتیش هەرچی هەیە

---

1) لەلایەن کاك مەلا بیلال قەڵادزەیی یەوە، خوا پاداشتی بداتەوە.

بەتێگەیشتن و ئەزموونی مسوڵمانان لەبارەی ئیسلامەوە دادەنرێ، نەك خودی ئیسلام).

2- پڕوپاگەندەی ژەهراویی و چەواشەكارانەی ناحەزانی ئیسلام كە لەڕووی بوغزو غەرەزەوە چاویان بەهیچ شتێكی ئیسلام هەڵنایەت و هیچ دانێكی خێری پێداناهێنن.

3- هەڵەو كەم و كووڕیی و كرچ و كاڵیی چەند دەستەو گرووپێك لە مسوڵمانان كە هەندێك قسەو هەڵس و كەوتی وایان هەیە لەگەڵ زۆر لە ڕاستییەكانی ئیسلامدا بەراوەژوویە.

پێشم وایە ئەم وتووێژە كۆمەڵێك ڕاستی گەورەو گرنگی لەبارەی لێبووردەیی و سەماحەتی ئیسلامەوە گرتوونە خۆی و مایەی ڕەواندنەوەی تەم و مژی زۆر تۆمەت و گومانانە لەو بوارەدا.

25ی ڕەجەبی 1430
18ی تەمووزی 2009
هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

بەڕێز ماموستا! تەوەرەی سەرەکی گفتوگۆکەمان، بریتیە لە: (تەبایی‌و پێکەوە ژیان)، چونکە بێگومان تەبایی‌و پێکەوە ژیان خاڵێکی گرنگی هەر کۆمەڵگایەکە کە بیەوێ قەوارەو کیانێکی هەبێ هەموو لایەك لەسایەیدا بەئاشتی پێکەوە بژین‌و لەڕووی سیاسیی‌و ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی‌و تەکنۆلۆژیی‌و هەموو بوارەکانی دیکەی ژیانەوە سەرکەوتوو بن.

تەبایی‌و پێکەوە ژیان لەولاتانی ڕۆژئاوادا بەشێوەیەکی تا ڕادەیەکی باش بەرجەستەیە، ئەوان بەشێوەیەکی ئاسایی جیاوازی یەکانی یەکتری قبووڵ دەکەن، هەروەها دەستەلاتیش دەستاو دەست پێ دەکەن بەشێوەیەکی ئاشتییانە! بەلام بە پێچەوانەوە لە ولاتانی ڕۆژهەلات بەگشتی یان لانی کەم زۆرینەیان، ئەم مەسەلەیە بەکەمی دەبینرێ بەتایبەتی لەڕووی سیاسییەوە، جا ئایا هۆکارەکانی چین؟ بۆچی ولاتانی ئێمە چەمکی تەبایی‌و پێکەوە ژیان بەچاکی تێیدا ڕەنگی نەداوەتەوە؟ بۆچی ئێمە جیاوازییەکانی یەکتری قبووڵ ناکەین؟ لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە ئێمە تێبگەین ئاینی بەرزی ئیسلام چۆن لە تەبایی‌و پێکەوە ژیان دەڕوانێ؟ ئیسلام بنەماکانی بۆ تەبایی‌و پێکەوە ژیان چین؟ ئەو ئایینەی کە بە درێژایی (1400) ساڵ توانی خەڵکانێك جێگە بکاتەوە لە چوارچێوەی کیانەکەیدا کە خەڵکەکە زۆر لێك جیاواز بوون لە ڕووی بیروباوەڕەوە! تا ئێستاش بوونی کەنیسەکان‌و بوونی ئاین‌و بیروباوەرە جیاوازەکان لە ولاتانی ئیسلامییدا بەگشتی‌و لە کوردستاندا بەتایبەت بەلگەی ئەوەن کە

ئایینی ئیسلام ئەو جیاوازییانەی قبووڵ كردوە، بەڵام چۆن؟ پشتیوان بەخوا لەم بەرنامەیەدا ڕوونی دەكەینەوە!

- بەڕێز مامۆستا سەرەتا دەمانەوێ لە چەمكی تەبایی‌و پێكەوە ژیانەوە دەست پێبكەین، بەڕێزت پێناسەت چیە بۆ تەبایی‌و پێكەوە ژیان، یان چۆن دەڕوانیە چەمكی تەبایی‌و پێكەوە ژیان؟

+ بسم الله الرحمن الرحيم الحمدلله وصلى‌الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه.

برای بەڕێزم كاك عومەر گوڵپی! بە پێویستی دەزانم بەر لەوەی بچینە نێو باسەكەمانەوە لەسەر داواكاریی چەند جارەی هەندێك لە برایانمان لە دەرەوە هەڵوەستەیەكی كورت بكەم لە بەرانبەر ئەو هێرش‌و پڕوپاگەندانەی كە دەكرێتە سەرمان وەك كۆمەڵی ئیسلامیی بەگشتی‌و بەندە بە تایبەتی!

- بەڵێ ماوەی دووسێ مانگێكە لێرەو لەوێ زۆر دەبینین لە پێگەكانی ئینتەرنێت‌و لە گۆڤارو ڕۆژنامەكاندا هەندێ كەس تۆمەتی جۆراو جۆری ناڕەوا بۆ ئێوە دروست دەكەن.

+ دیارە لە نێوخۆی كوردستاندا ئەو قسانە ئێكسپایەر بوون‌و ئێستا پێموایە كڕیاریان نیەو كەس بەهەندیان وەرناگرێ، چونكە بۆیان دەركەوت ئامانجی خۆیان ناپێكن، بەڵام لە دەرێ هەندێك كەس هەر هەیە ئێستاش بازاڕی خۆی بەو قسانە گەرم دەكا! هەڵبەتە منیش لەسەر داوای ئەو برا خۆشەویستانەمان كە زۆریان تەلەفۆن كردو داوایان كرد هەڵوێستێكمان هەبێ، بۆیە بە كورتی دەڵێم:

کەسێك هەموو کەلوپەل (بضاعة)ەکەی ئەوەبێ تۆمەت بۆ خەڵك هەڵبەستێو قسە بەخەڵك بڵێ، ئەو کەسە ئینسانێکی شکست خواردوویە، ئینسانێکی هیچ پێ نەبوویە! ئینسان دەبێ بە شتی باش خۆی بینا بکا، نەك هەموو هونەرەکەی ئەوەبێ کە بیەوێ خەڵك بڕووخێنێ!، نا دەبێ خەریك بێ خۆی بینا بکا، ئەوە یەك، دووەم: ئەوانەی لە دەرەوەو نێوەوەی کوردستان قسە بە ئێمە دەڵێن، لە دوو حاڵەت بەدەر نین: یان کەسانێکی ناحەز بە ئیسلامو تەوژمی ئیسلامیین، وە ئەو ناحەزییو ڕقو کینەیەش کە بەرامبەر بە ئیسلام هەیانە زۆر جار ناوێرنو جورئەت ناکەن ڕاستەوخۆ بیخەنە ڕوو، بۆیە دێن بە قسە پێگوتن، ناوزڕاندن (تشهیر)ی ڕەمزەکانی تەوژمی ئیسلامیی ئەو شتە دەردەبڕن!

یان کەسانێکن مسوڵمانانێکی کینە لەدڵن، حەسەدو حیقدیان هەیەو لەگۆڕەپانی کاری ئیسلامییدا شکستیان خواردوەو فەشەلیان هێناوەو نەیان توانیوە شتێکی باش پێشکەش بکەنو سەرەنجام گۆڕەپانەکەیان بەجێهێشتوە، یاخود کەنار کەوتوون، ئیدی دەیانەوێ تێی هەڵێننەوەو قەرەبووی بکەنەوە! پاشان وەك جاری دیکەش گوتوومە ئەو قسانە کە دەکرێن من نەمکردوە بەعادەت وەڵامی قسەی سووکی خەڵکی بچووك بدەمەوە! چونکە بەڕاستی من پێموایە ئەو کەسەی تۆمەت بۆ خەڵك هەڵدەبەستێ، درۆ دەکا، نەجارێك نەدوو نەدە دووبارەی دەکاتەوە، ئەو ڕفتارەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەکەسێکی بچووکە، چونکە ئینسانی بچووك قسەی سووك دەکا! ئەگەرنا ئەوانەی کە ڕەخنەیەکیان هەیە لە کۆمەڵی ئیسلامیی لەدیدو سیاسەتەکانی

كۆمەڵی ئیسلامیی یان لەبیروبۆچوونەكانی (بەندە) ئێمە بەسوپاسەوە لێیان وەردەگرین، چونكە خۆ ئێمە خۆمان بە پارێزراو (معصوم) لە هەڵەو كەموكووڕیی نازانین‌و پێویستیمان بە ئامۆژگاریی‌و ڕەخنە لێگرتن‌و تێبینی‌و سەرنج خستنەڕووی هەموو كەسێكی دڵسۆز هەیە، بۆئەوەی كارەكەمان زیاتر بەهێزوپێزبێ‌و گەشە بكا، وە لەسەر ئەوە سوپاسیشیان دەكەین، بەڵام من تا ئێستا ڕەخنەیەكی سیاسیی‌و فیكریی نابینم، هەرچی دەیبیستین بەزۆری تۆمەت هەڵبەستن‌و لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشاكردن‌و زۆریشی هەر درۆو دەلەسەیە، بڕواتان بێ جاری وایە شتێك دەخوێنمەوە لە(ئەلف)ی یەوە تا (ی) شتێكی ڕاستی تێدانیە!

جا بەڕاستی ئێمە كاتی خۆمان لەوە بە گرنگتر دەزانین كە بەزایەی بدەین لەوەلامدانەوەی ئەو جۆرە قسانەدا، وەمن قسەیەكی دیكەش دەكەم -جارانی دیكەش ئەوەم هەر گوتوە- كەسێك كە نیشانەیەك دادەكا ئەگەر لەونیشانەیە بداو بیپێكی بەیەك فیشەك وازدێنێ، وە ئەگەر بەیەكەم فیشەك لێی نەدا بەدووەم لێی بدا وازدێنێ، بەڵام كەسێك كە دە (10) فیشەك یان بیست (20) یان سەد (100) فیشەكی پێوە دەنێ، مانای وایە لەنیشانە نادا، كەواتە بێ هوودە خۆی ماندوو دەكا، دیارە ئەو قسانە ئامانج ناپێكن، بۆیە پێویست دەكا كابرا ئەمڕۆو سبەینێ‌و دووسبەی هەمیشە دووبارەیان بكاتەوە، لەم سایت لەم گۆڤارە، لەم ڕۆژنامە لەو كەناڵ لەو كەناڵ، بێهوودە خۆی ماندوو دەكا، وەبەڕاستی لەخوا بەزیادبێ پەرێزی ئێمەش -وەك نیعمەتی خوا لەسەرمان- وە ڕابردووی ئێمە، وە كردەوەكانی ئێمە، بۆ خۆیان باشترین

وەڵامـی ددان شـکێنن بـۆ ئـەو جـۆرە قسـەو پڕوپاگەندانـە، هـەروەها گەشەکردنی ئێمە لەنێو خـەڵكو میللـەتی خۆمانـدا، وە فراوانبـوونی بنکەی جەماوەریی‌و زیادبوونی ئەندامان‌و دۆستان‌و لایەنگرانی ئێمـە، وەڵامـە بۆ ئەو پڕوپاگەندەو تۆمەتانە!

دواقسەشم ئەو دێڕە شیعرەی ئیمام شافیعیە ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ، کەدیارە پێشینەی چاکیشمان هەر ئەوە حاڵیان بووەو قسەیان پێگـوتراوە لەلایەن ناحەزانیان‌و خەڵكی حاقیدو فاشیلەوە، کەدەڵێ:

يواجهني السفيه بكل قبحٍ    فأكره ان أكون لهُ مجيبـاً
فيزداد سفاهة وأزداد حِلْماً    كعود زاده الإحراق طيباً

واتە: ئینسانی نەفام بە هەموو شێوەیەکی ناشیرین لەگەڵم ڕوو بەڕوو دەبێتەوە، بەڵام حەزناکەم وەڵامی بدەمەوە، ئەو لە نەفامیی زیاد دەکـاو من لەئارامی زیاد دەکەم، وەك (عود)ێك هەتا بیسووتێنی بۆنی خۆشی زیاتر بڵاو دەبێتەوە!!

واتە: وەك چۆن بخوور هەتا زیاتر بسووتێ بۆنی خۆشی پتر بڵاوبێتەوە، ئێمەش هەتا زیاتر ئازار بدرێین لە ئـارامیی‌و هێـدێی‌و مەنـدیی زیـاد دەکەین، جا سوپاس بۆ خوا ئێمەش وەك ئەو پێشـینەی چـاك (السـلف الصالح)مان لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا مامەڵە دەکـەین! وەك گوتیشـم ئێمە کات‌و وەختی خۆشمان لـەوە بـە باشـترو بـەنرختر دەزانـین کـە بـە وەڵامدانەوەی ئەو قسەو پڕوپاگەنـدە بـێ نـرخ‌و کـەم بایەخانـە زایـەی بکەین.

- زۆر سوپاس بۆ ئەم پێشەكیو هەڵوەستەیە، مامۆستای بەڕێز دەربارەی وەڵامی پرسیارەكەمان كە سەبارەت بە تەباییو پێكەوە ژیانە، بێگومان ئەو جۆرە تۆمەتو سووكایەتیو حاڵەتانەشن كە بوونەتە هۆكاری دیاریكردنی هەڵبژاردنی ئەم بابەتەی تەباییو پێكەوە ژیان، سەرەتا دەپرسین:

- ئایا تەباییو پێكەوە ژیان چییەو گرنگییەكەی لەچیدایە؟

+ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەڵێین: كۆمەڵگای سەركەوتوو ئەو كۆمەڵگایەیە -جا بازنەیەكی تەسك یاخود فراوانی هەبێ- كە هەموو پێكهاتەكانیو هەموو تاكەكانیشی، هەر كامێكیان هەمان ماف كە بەخۆی ڕەوا دەبینێ، بە بەرانبەرەكەشی ڕەوا ببینێ، وە كۆمەڵو پێكهاتەكانی وەك چۆن بۆ خۆیان حەز دەكەن كە ئازادیی بیروڕا، ئازادی دینداریی، ئازادی كارو كەسابەت، ئازادییە تاكییەكانیان هەبێ، وە وەك چۆن حەز دەكەن بۆخۆیان ڕێز لێگیراو بنو مافیان پێشێل نەكرێ، دەبێ هەمان ئەو شتانە بە بەرامبەرەكانیشیان ڕەوا ببینن، ئەو جۆرە كۆمەڵگایە كۆمەڵگایەكی سەركەوتوویە، وە هەر كۆمەڵگایەك بەو شێوەیە بوو، واتا جیاوازییەكانی یەكتریان قبووڵ كردو دانیان بە بوونو مافی یەكدی هێناو، ڕێزو حورمەتی یەكدیان پاراست، ئەوە بێگومان ئەو كۆمەڵگایە بەرەو پێش دەچێ.

وەك بەڕێزت ئاماژەت پێدا كە ئێستا كۆمەڵگاكانی ڕۆژئاوا تا ڕادەیەك ئاشتییو ئارامییان تێدا سەقامگیرە، بۆچی؟ چونكە پێكەوە تەبان، وەلەڕاستیدا ئاشتی لە تەباییەوە پەیدا دەبێ بەڵێ لە پێكەوە گونجانو لەیەكدی قبووڵكردنو لە ڕێز لە یەكدی گرتن ئاشتی پەیدا

دەبێ ئەدی کێشەو ئاژاوە لەچی پەیدا دەبێ بێگومان لە پێکەوە نەگونجانو ناکۆکیو لافو گەزاف بەسەر یەکدا لێدانو ئیمتیاز بەخۆ ڕەوا بینین لەسەر حیسابی خەڵك، جا ئیمتیازی سیاسی بێ، یان ئابووری، یان کۆمەڵایەتی، ...هتد، هەر جۆرە ئیمتیازێك بەخۆت ڕەوا ببینیو غەیری خۆتی لێبێبەش بکەی، کێشەو ئاژاوەی لێ پەیدا دەبێ، هەمیشە تەبایی دەبێتە هۆی ئاشتی، دادگەریی دەبێتە هۆی ئاشتی، وە بەپێچەوانەوە زوڵمو ستەم دەبێتە هۆی کێشەو ئاژاوەو ململانێ.

ئەوە پێناسەیەکی کورتی تەباییو پێکەوە ژیانە، دیارە بێگومان کۆمەڵگایەك بەیەکەوە تەبا بوو، ئەوجار دەتوانێ پێکەوە بژی، ئەگەرنا لەجیاتی ئەوەی پێکەوە بژی دەبێ پێکەوەبەشەڕبێو بمرێ، دەشبینین کۆمەڵگای کوردەواری خۆمان لە قۆناغێکدا لەبەر ئەوەی پێکەوە تەبا نەبوو، بەڵکو ناتەباو پێکەوە نەگونجاو بوو، تەماشا دەکەی سەرگەرمی شەڕو ئاژاوە بووین لەگەڵ یەکدیدا، وەهەروەها لەکۆمەڵگاکانی دیکەشدا، هەروایەو هەرواش دەبێ! بەڵام سوپاش بۆ خوا ئێمە ئەو قوناغەمان تێپەڕاندوە خوا یاربێ ناگەڕێینەوە سەری، بەڵام ئێستاش لە هەندێك کۆمەڵگای دواکەوتوودا خەڵکێکی دواکەوتوو هەیە لەجیاتی ئەوەی پێکەوە بژین، پێکەوە دەمرن، لەجیاتی ئەوەی یەکدی دروست بکەن یەکدی دەڕووخێنن.

ـ بەڕێز مامۆستا علی باپیر ئەمیر کۆمەڵی ئیسلامیی! ئێمە لەم ڕوانگەی ئەو پێناسەو پێشەکیەی جەنابتەوە دەپرسین: ئایا هیچ جێگرەوە (بدیل)یەکمان بۆ تەباییو پێکەوە ژیان هەیە؟

+ هیچ بەدیلێك نیە غەیری دەست لەیەخەی یەكترنان، غەیری ململانێ كردنو مل لەبەر ملی یەكترنان، دەبێ ئێمە یان پێكەوە مەدار بكەین یان دەبێ دار لەیەكتر دەست بدێنێ، وەك زۆرجار گوتوومە: یان دار یان مەدار! مادام پێكەوە مەدار نەكەین دەبێ دار لە یەكتر دەست بدەینێ، واتە: دەبێ چەك لەیەكتر دەست بدەینێو سەنگەر لەیەكتر بگرین، ئینجا بەڕاستی لە ئەنجامی سەنگەر لەیەكتر گرتنیشدا بینیومانە كە باجی زۆر خراپ دراوە، وە لەئەنجامی پێكەوە هەڵنەكردندا هیچ بەدیلێكی دی نیە جگە لە دەست چوونە خوێنی یەكترو دەست چوونە كەرامەتو بوونی یەكدی، كە سەرەنجامەكەی زۆر شووم بووە، وە پێشینانمان زۆر جوانیان گوتوە: ( بە بای و بەبارانێ هەر لە بەفر كەم دەبێ) یانی: چ (با) هەڵبكات چ (باران) بباریێ، هەر بەفر دەتوێتەوە، واتە: كاتێك دوو نەتەوە، دوو حیزب، لەنێو چوارچێوەی ولاتێكدا بەشەڕ دێن، یان دوو نەتەوە لەسەر ئاستی بەشەریەتیش كاتێك پێكەوە بەشەڕ دێن، لەكێ كەم دەبێتەوە؟!

بێگومان هەر لەخۆیانو هەردوولاشیان زەرەر دەكەن، بۆیە دەڵێین: نەخێر تەبایىو پێكەوە ژیان هیچ بەدیلێكی نیە جگە لە شەڕو ئاشووبو ئاژاوە.

- مامۆستا! ئێستا ئەوەی كە بەرچاوە، ولاتانی ڕۆژئاوا لە ئاشتییو ئارامییو تەبایىو پێكەوە ژیانێكی باشدا دەژین، ئەوان جیاوازییەكانی یەكتری قبووڵ دەكەن، ئەوان بەئاسانی دەرەنجامی هەڵبژاردنەكان قبووڵ دەكەن، هەروەها ئایینەكانی یەكتر قبووڵ دەكەن، بەبڕوای جەنابت

هۆكاری ئەوە بۆچی دەگەڕێتەوەو بۆچی ڕۆژئاوا ئەو حاڵەتە باشەی تێدا بەرجەستەیە لەڕووی تەبایی‌و پێكەوە ژیانەوە؟

+ من سەرەتا دەڵێم پێویستە ئێمە شتی باش لە هەر شوێنێك هەبێ‌و لەلای هەركەسێكەوە بێ بەسوپاسەوە وەری بگرین، ئیسلام وای فێركردووین خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... فَبَشِّرۡ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٨﴾ الزمر﴾، واتە: دەجا موژدە بدە بەو بەندانەم كە گوێ بۆ قسان دەگرن، جا باشترینی هەڵدەبژێرن‌و شوێنی دەكەون، ئا ئەوانە كەسانێكن خوا ڕێنمایی كردوون‌و ئا ئەوانەن خاوەن عەقڵن.

كەواتە ئینسانی موژدە پێدراو لەلایەن خوای پەرروەردگارەوە ئینسانی خاوەن عەقڵ‌و ڕێنمایی كراو لە ڕوانگەی قورئانەوە، كەسێكە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرێ، وەكامەی باشتربێ هەڵی دەبژێرێ‌و شوێنی دەكەوێ.

جا وەك پێشەكی یەك بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە كە ئایا هۆكاری ئەوە كە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا سەقامگیریی‌و تەبایی هەیە، چییە؟ دەڵێم! بێگومان ئەوە شتێكی باشی ئەوانەو پێویستە ئەو شتە باشەیان لێ وەربگرین وە بەوەش ئێمە شتێكی چاك دەكەین، چونكە فەرمانی قورئانمان جێبەجێ كردوە، بەڵام ئایا وەك هەندێك خەڵك كە دەیانەوێ میللەتی ئێمە چەواشە بكەن، ئایا ئەو تەبایی‌وپێكەوە ژیانەی ئەوان بەرهەمی دوركەوتنەوەیانە لە دینەكەیان؟ وە ئایا ئێمەش ئەگەر لە دینەكەمان دووربكەوینەوە ئەو حاڵەتە باشەمان بۆ دروست دەبێ؟! یان

بەپێچەوانەوە تەباییەكەیان بەرهەمی شتێكی دیكەیە؟ من لەكتێبی (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان)دا لە باسی تەبایی و پێكەوە ژیاندا، باسم كردوە، كە لەڕاستیدا وڵاتانی ڕۆژئاوا بە ئەمریكاشەوە، كاتێك گەیشتنە ئەوە كەئەزموونی زۆر تاڵیان بینی لە پێكەوە نەژیان و ناتەبایی و ململانێ و دووبەرەكیداو خوێنی زۆریان لەیەكدی ڕشت، هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن: زیاتر (15-20) ملیۆن خەڵك لەنێوانیان كوژرا لە شەڕەكانی نێوان پروتستانت و كاثولیك، لەسەر جیاوازی دینی كە هەر دووكیشیان هەر نەصڕانیی بوون، جا دوای ئەوەی ئەزموونی زۆر تاڵیان بینی و بەری تاڵی شەڕو ئاشووب و ناكۆكی لەسەر بنچینەی دەمارگیریی دینی یان بینی، ئینجا پەندیان وەرگرت، دیارە عاقڵ ئەو كەسەیە پەند وەربگرێ، نەك هەر لەهەڵەكانی خۆی بەڵكو لە هی خەڵكی دیكەش، وە ئەوانە پەندیان لەهەڵەكانی خۆیان وەرگرت و بڕیاریاندا لەمەودوا بەیەكەوە تەبابن و پێكەوە بژین، دیارە ئێستاش (پڕوتستانت) و (كاثولیك) و (ئەرثذوكسن) هەرسێك بیروڕاو تاقمی نەصڕانیی هەر هەن، بەڵام بڕیاریاندا پێكەوە بگونجێن و هەڵبكەن، نەك هەرسێ تاقمەی نەصڕانییەكە، بەڵكو بە دین و بێ دین بڕیاریاندا یەكدی تەحەممول بكەن و جیاوازییەكانی یەكدی قبووڵ بكەن!

كەواتە لەڕاستیدا ئەوان لەئەنجامی هەڵەی خۆیان و ئەزموونی تاڵی خۆیاندا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی كە دەبێ پێكەوە بژین و تەبابن و یەكدی قبووڵ بكەن، لەپێناو هێنانەدی ئەو ئاشتی و ئارامییەدا كە پێی گەیشتوون.

ـ مامۆستا! هەندێك كەس پێیان وایە لەبەرئەوەی ئاینیان خستۆتەوە قاڵبەكەی خۆی، واتە: كەنێسە، بۆیە ئەوان توانیویانە بەم ئەنجامەی ئێستایان بگەن!

+ وەك جاری دیكەش گوتوومانە: نەصرانییەت واتە ئەوەی لە ڕۆژئاوا هەبووەو ئێستاش هەیە، ئەو دینو شەریعەتە پاكە نیە كە خوا بۆ عیسی (علیه الصلاة والسلام) ناردی، هەروەها یەهوودییەتو هەموو ئەو شەریعەتە ئاسمانییانەی دیكە كەخۆیان پاڵ دەدەنە لای خواو ئاسمان، بەهەمان شێوە وەك زەردەشتایەتییو یەزدیایەتییو....هتد، هەموویان دەستكاریی كراونو گۆڕدراون، جایان هەر لە ئەسڵدا تاقمێك بوون لە مسوڵمانان جیابوونەتەوە، یان لەئەسڵدا كتێبێكی ئاسمانییان هەبووەو دوایی گۆڕیویانە، بەڵێ جا ڕۆژئاواییەكان هەر لە ئەسڵدا دینەكەیان ئەو دینە ڕاستە نەبووە، كە خوا بۆی ناردبوون بەڵكو گۆڕابوو و دەستكاریی كرابوو.

پاشان ئێمە دەڵێین: بەڵێ وایە دەمارگیریی دینی،واتە ئەودینە هەڵەو شێوێنراوەی كەخۆیان دایانتاشیبوو، بوو بەمایەی شەڕو ئاشووبو ئاژاوە لە نێوانیاندا، بەڵام ئەوەی كەوای لێكردن پێكەوە تەبابنو پێكەوە بژین دەستبەردار بوونیان لە ئایینەكەیان نەبوو، ئەوەتە نەصرانییەتیان هەر لەنێودا ماوە، بەڵكو ئەوەبوو كە وازیان لە دەمارگیریی (تعصب) هێنا، وە وازیان لە مومارەسەی هەڵەی دینداریيان هێنا، دیارە ئێمەش وەك مسوڵمان ئەگەر هەڵەیەكمان هەبێ لە مومارەسەكردنی دینە ڕاستەكەماندا دەبێ دەستی لێ هەڵبگرین! بەڵام ئایا ناتەباییو ئاشووبو ئاژاوەی نێو خۆی مسوڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام؟!

وەك دواتر باس دەكەم ئێمە كە سەرنجی شەریعەت دەدەین (16) بنەمامان هەیە هەركامیان لەسەر مسوڵمانان پێویست دەكا كەدەبێ تەبابن لە نیۆ خۆیاندا، وە دەبێ لەگەڵ غەیری مسوڵمانانیشدا تەباو گونجاو بن‌و ئاشتییانە پێكەوە بژین.

- كەواتە: بەكورتی ولآتانی ڕۆژهەلآت یاخود ولآتانی ناسراو بەولآتانی جیهانی ئیسلامیی بۆچی تەبانین بۆچی پێكەوە ناژین‌و یەكتر قبووڵ ناكەن؟!

+ لە ڕاستیدا ئەوە دوو هۆكاری هەیە:

یەكەم: باش تێنەگەیشتن لە دینەكەیان كە بێگومان ئەوەیان هۆكاری سەرەكیە.

دووەم: دەست تێوەردانی ولآتانی زلهێزی ڕۆژئاوا لە كاروباری نێوخۆی مسوڵمانان.

سەرنج دەدەین لەنێوان هەردوو ولآتی مسوڵماندا، وەك: میسرو سوودان‌و لە نێوانی سعوودیە ـ یەمەن، وە عیراق ـ كوێت، وە لەنێوان زۆری دیكەیاندا شوێنیكی جێگای ناكۆكیان داناوە كە وەك بۆمبی كاتیی لەكاتی دیاریكراودا كە مەبەستیان بوو بیتەقێننەوە! كێ ئەم ولآتانەی ئاوا دابڕدابڕ كردو دابەش كرد؟! مەگەر پەیمانی (سایكس بیكۆ) نەبوو؟! كە لە نێوان بەریتانیاو ڕووسیاو فەرەنسادا مۆركراو پاشان لەلایەن ولآتانی ڕۆژئاواشەوە پشتگیریی لێكرا، لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو ولآتانە ئاوا دابەش بوون‌و كرانە دەوڵەتۆكەی بچووك بچووك تاكو بەئاسانی بەسەریاندا زاڵ بن‌و خێرو بێریان بەتاڵان بەرن! كەواتە هۆی ناتەبایی‌و ناكۆكی ولآتانی مسوڵماننشین دووانن، هۆكارێكی زاتی، كە

بریتیە لە باش تێنەگەیشتنی مسوڵمانان لەدینەكەیان وە پێوەپابەند نەبوونی، وەهۆكارێكی دەرەكی كە بریتیە لەدەست تێوەردانی زلهێزەكان لەكاروباری نێوخۆی وڵاتانی مسوڵمان، وەناكۆكی خستنە نێوان مسوڵمانان تاكو لەنێوخۆیاندا بەكێشەو گرفتەكانی خۆیانەوە سەرگەرم بن‌و ئاگایان لەوە نەمێنی كێ نەوت‌و كەرەستەی خاوو خێرو بێری وڵاتەكەیان دەدزێ، وە كێ حوكمیان بەسەردا دەكاو، كێ فیكرو فەرهەنگی خۆییان بەسەردا دەچەسپێنی! كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ) یان (ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەكا)، وە ئەو وڵاتە زلهێزانەی باسكران دەیان گرفت‌و كێشەیان لەنێو جیهانی ئیلامییدا دروستكردوە.

- مامۆستا! زۆربەی كات وا ناسراوین كە ئێمەی گەلانی ڕۆژهەڵات كەم‌و كووڕیی‌و خەتاكان دەخەینە دەرەوەی خۆمان یاخود دوژمنەكانمان، بەڕێزتان لەگەڵ ئەوەدان؟

+ نا من لەگەڵ ئەوەدا نیم، بۆیە من لە سەرەتاوە گوتم هۆكاری سەرەكی بریتیە لە باش تینەگەیشتن لە ئیسلام‌و پراكتیزەنەكردنی، وە لەڕاستیدا هەر ئەم هۆكارەشە كە زەمینەی خۆش كردوە بۆ هۆكاری دووەم، چونكە ئەگەر مسوڵمانان بەڕاستی لە ئیسلام تێبگەن‌و پێیەوە پابەند بن، یەك ئۆممەت دەبن، وەك خوا فەرمانی پێكردوون: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ الأنبياء﴾، یەك كۆمەڵ دەبن‌و پێكەوە یەكگرتوو جۆشدراوو گونجاو دەبن‌و یەكدییان خۆشدەوێ‌و ستەم لە یەكدی ناكەن‌و مافی بوون‌و ژین بەیەكدی ڕەوا دەبینن، دیارە ئەو كاتەش كە ڕیزەكانیان پێكەوە جۆشدراو بوون‌و پێكەوە تۆكمەو توندو

تۆڵ بوون، کەس تەماعیان تێناکا، چونکە هەمیشە دوژمنانیان لە کەلێنو درزەکانیانەوە دێنو زەفەریان پێدەبەن!

جاری دیکەش باسمان کردوە کەعومەری کوڕی خەتتاب خوای لێی ڕازی بێ کە سوپای مسوڵمانانی بەڕێ دەکرد ڕایدەسپاردنو دەیگوت: ئامۆژگارییتان دەکەم کەلە گوناحەکانتان وریابن، من لە گوناحەکانتان زیاتر مەترسیم لێتان هەیە وەك لە دوژمنتان، چونکە دوژمنیشتان بەهۆی گوناحەکانتانەوە زەفەرتان پێ دەبا! وە لەپێش عومەریشدا خوا -سبحانە وتعالى- لەبارەی هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ کە لە جەنگی (ئوحود)دا تێدەشکێنو سەریان سوڕدەمێنی!، دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٦٥﴾ آل عمران، واتە: ئایا کاتێك بەڵایەکتان تووش هات پێشتر دووقاتی ئەوەتان تووشی دووژمنانتان کردبوو (چونکە مسوڵمانان لە جەنگی (ئوحود)دا (70) کەسیان لێ کوژرا، بەڵام لە جەنگی (بەدر)دا (70) کەسیان لە بێبڕوایان کوشتبوو و (70)شیان لێ بەدیل گرتبوون) گوتتان: ئەوە چۆن وامان لێهاتو دوژمن زەفەری پێبردین؟! پێیان بڵێ: ئەوە تاوانو خەتای خۆتانە! واتە: خۆتان کەلێنتان داوە کە دوژمنتان زەفەرتان پێ بەرێ!

(مالك بن نبي) ڕەحمەتی خوای لێبێ کە یەکێکە لە بیرمەندو بیریارانی ئیسلامیی، دەربڕین (تعبیر)ێکی جوان بەکاردێنێ دەڵێ: هیچ میللەتێك ناچەوسێندرێتەوە تاکو شایستەی چەوساندنەوە نەبێ، کە ئەو پێی دەڵێ: (القابلیة للأستعمار)، دەبێ خۆی شایستەیی

چەوسێندرانەوە لەخۆیدا پەیدا بکا، ئەوکاتە دوژمن و ناحەزانی دەتوانن بەسەریدا زاڵ بن و زەفەری پێ بەرن.

ئێستا وەك پزیشکەکان دەڵێن: هەمیشە دنیا پڕە لە میکرۆب و ڤایرۆسی زیان بەخش، بەڵام هەندێك لە جەستەکان نەخۆش نابن، چونکە بەرگریی (مناعة، حصانة)یان هەیە، کەچی ئەو جەستانەی لاوازن، میکرۆب و ڤایرۆسەکان زەفەریان پێ دەبەن.

- سوپاس مامۆستای بەڕێز، بێگومان بەڕێزت بەتەواوەتی دەتەوێ بەبەڵگە بیسەلمێنی کە هۆکاری ناتەبایی و پێکەوە نەژیانی گەلانی ڕۆژهەڵات ئایینی پیرۆزی ئیسلام نیە، بەڵکو بەپلەی یەکەم خەتای خەڵکەکە خۆیەتی و پاشان هی دوژمن و ناحەزەکانی.

+ بەڵێ.

- بەڕێز جەنابی مامۆستا عەلی باپیر! دەمەوێ بپرسم کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام چۆن دەڕوانێتە تەبایی و پێکەوە ژیان، یان ئەو بنەمایانە کامانەن کە ئیسلام دایڕشتوون بۆ ئەوەی خەڵك بەئاشتی و تەبایی پێکەوە بژین و جیاوازییەکانی یەکتری قبووڵ بکەن؟ پرسیاری جەوهەری ئەوەیە: ئایا خودی ئایینی ئیسلام زەمینەسازیی کردوە بۆ قبووڵ کردنی غەیری خۆی؟!

+ بەڵێ، سەرەتا من هەڵوەستەیەك دەکەم لەبەرانبەر وشەیەکدا کە بەڕێزت بەکارتهێنا، ئەویش بریتییە لە وشەی (ڕوژهەڵات) یان (ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست)، بۆ زانیاری جەنابت ئەم زاراوەیە لەلایەن وڵاتانی ئەورووپییەوە بەکارهێنراوە بۆ جیهانی ئیسلامیی، لەبەر ئەوە واباشە ئێمە ئەم زاراوەیە بەڕەهایی بەکارنەهێنین! چونکە کەدەشگوترێ

ڕۆژهەڵات، ئەوە چین‌و یابان ڕووسیاو غەیری ئەوانیش لە وڵاتانی نائیسلامیی دەگرێتەوە، بەڵام لەئەسڵدا ئەوان کە ئەم وشەیان بەکارهێنا وەك سیاسەتمەداران‌و زانایانی کۆمەڵناسی ئیسلامیی دەڵێن: بۆ ئەوەیان بەکارهێنا تاکو نەڵێن (جیهانی ئیسلامیی) وە ئینتیما فیکریی‌و عەقیدەییەکە بیر مسوڵمانان نەخەنەوەو بیان گێڕنەوە بۆ ئینتیمای جوگرافی، چونکە کە گوترا: جیهانی ئیسلامیی، ئەوانیش دیارە وەك جیهانی نەصرانیی دەبینرێن لە بەرانبەردا، بۆیە مەگەر دنیا دابەش بکەین بۆ ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات ئەگەرنا ئێمە بەکاری ناهێنین بەڵکو دەڵێین: جیهانی ئیسلامیی، ئوممەتی ئیسلام، گەلانی مسوڵمان...

بۆ وەڵامی پرسیارەکەشت کە ئایا ئەو بنەماو بنچینانە چین کە ئیسلام ڕەچاوی کردون بۆئەوەی لەسەر ئاستی بەشەرییەت بە گشتی‌و بەتایبەت لەسەر ئاستی دەوڵەت‌و کۆمەڵگای ئیسلامیی، بەهەموو پێکهاتەکانیەوە بە مسوڵمان‌و نامسوڵمانەوە، وە لەسەر ئاستی مسوڵمانان بەتایبەتی تر، تەبایی‌و پێکەوە ژیان‌و پێکەوە گونجان هەبێ، ئەو بنەماو بنچینانە چین؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لەسەر ئاستی هەرسێك بازنەکە:

1- بازنەی مسوڵمانان.

2- بازنەی مسوڵمانان‌و نامسوڵمانان، بەڵام لە چوارچێوەی کیانێکی ئیسلامیدا.

3- وەبازنەی مسوڵمانان‌و نا مسوڵمانان لەسەر ئاستی بەشەرییەت.

من کە سەرنجی قورئانم داوە (15‌16) بنەمام کەوتوونەتە بەرچاو کە ئێمەی مسوڵمان دەتوانین بیانکەینە بناغەی تەبایی‌و پێکەوەژیان،

لەسەر ئاستی هەرسێ بازنەکە، کە بێگومان بنەمای دیکەش هەر هەن، بەڵام بە پێویستی دەزانم بەرلەوەی بچینە سەر ژماردنی ئەو بنەمایانە، وەك ڕێخۆشکردن سەرەتای قسەکانم بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دەست پێبکەم کە دەفەرموێ: **(أحبّ الدين الى الله الحنيفية السمحة)** رواه البخاري في الادب، ورواه احمد وغيرهما، واتە: خۆشەویسترین دینداریی لای خوا، یان خۆشەویسترین بەشی مسوڵمانەتی لای خوا بریتییە لەلادان لەهەموو شتێکی پووچو قرپۆك (باطل) بۆ حەق، وە نەرمو نیانییو گونجاویی ئاسانکاریی لە هەڵسوکەوتدا.

وشەی (الحنيفيّة) وەسفی شەریعەتە، (الحنيف) واتە: لادەر لە (باطل)ەوە بۆ حەق، (حَنَفَ) واتە: لە ناحەقەوە بەرەو حەق گەڕایەوە، بۆیە ڕێبازی ئیبراهیم (عليه الصلاة والسلام) بە (حنيف) لە قەڵەم دراوە (حنيفاً مسلماً) واتە: وازی لە هەموو شێوەکانی (باطل) هێنا، یاخود هەموو شێوەکانی (باطل)ی ڕەفز کردو بەرەو حەقی ڕەها (مطلق) کە لە خوا بەیەکگرتندا خۆی دەبینێتەوە، هاتوە، وشەی (السمحة)ش (صفة)یە بۆ (موصوف)ێکی (محذوف) واتە: شەریعەتێکی (السَمحاء) وشەی (سمح) لە زمانی عەرەبیدا واتە: نەرمو ئاسان، ئینجا لێرەدا کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خۆشەویسترین دینداریی لای خوا حەنیفییەتو تەسامحە، واتە: لەڕووی ئیمانو عەقیدەوە ئینسان واز لە هەموو شێوەکانی (باطل)و ناحەق بێنێو ڕەفزیان بکاتەوە، وە خوا بەیەکگرتن (التوحيد) بگرێ کە حەقی ڕەها (مطلق)یە، پاشان لەڕووی هەڵسوکەوتیشەوە شێوازی تەباییو گونجاویی ئاسانیی (تسامح) هەڵبژێرێ.

## بنەمای یەكەم: خوا . سبحانه وتعالی . بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوو خاوەنی هەموو جیهانییانە:

دیاره ئێمه وەك مسوڵمان پێنج فەڕزەی نوێژ له سووڕەتی (الفاتحة)دا دەڵێین: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢﴾، واته: (ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان) لێرەدا تۆی مسوڵمان وەك تاك و كۆمەڵی مسوڵمان یەكسەر هەست دەكەی كە ئەو خوایە -جل شأنه- هەر پەروەردگاری تۆ نیە، هەر مشوورخۆرو بەخێوكەری تۆ نیە، هەر تۆی دروست نەكردوەو، بەس بەسەر تۆ ڕانەگەیشتوەو، ژیانو مانو ڕزقو ڕۆزی هەر بۆ تۆ دابین نەكردوە، بەڵكو بۆ هەموو جیهانییان!!

جا جیهانییان (العالمین) چ مەبەستی پێ جیهان (عالم)ی بەشەر بێ، یان مەبەستی پێ جیهانی بەشەرو جند (جن) بێ، یان مەبەستی پێ بەشەرو جندو فریشتەكان بێ، یان مەبەستی پێ ئەمانە هەرسێكیانو ژیاندارانو ڕووەكو كەهكەشانەكانیش بێ، هەمووی دەگرێتەوە، ئێمە پێنج فەڕزە ستایشی خوایەك دەكەین كە پەروەردگاری هەموو جیهانەكانە، واتە مرۆڤ ستایشی پەروەردگاری جیهانەكان دەكا، ئینجا بێگومان ئەوە بنەمایەكی گەورەی تەبایی‌و پێكەوە ژیان قبووڵكردنی یەكدیە لە قورئاندا، چونكە ئێمە كە (تەلموود) یان (تەوڕات) یان (پەیمانی كۆن) (العهد القدیم)دا دەخوێنینەوە، سەرنج دەدەین تێیدا هاتوە دەڵێ: یەهوا تەنها خوای جوولەكەكانەو تەنها مشوور لەوان دەخوا، وە تەنها بەوانەوە ماندوویە، وە هەموو خەڵكی دیكەی بۆ خزمەتی جوولەكە (یهود) دروستكردوە!!

بەڵام ئیسلام، قورئانی ئێمە چی دەڵێ؟! دەفەرموێ: ﴿فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾ الجاثية﴾، واتە: دەجا ستایش بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکانو پەروەردگاری زەوی. پەروەردگاری جیهانییان. وە گەورەیی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەر هی ویە، وە ئەو زاڵی کاربەجێیە.

وە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ البقرة﴾، واتە: ئەی خەڵکینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی دروستکردوە بەڵکو پارێز بکەن.

لێرەدا خوای باڵادەست واخۆی بۆ ئێمە پێناسە دەکا کە هەر خواو خاوەنو پەروەردگارو پەرستراوی ئێمە نیە، بەڵکو خواو خاوەنو پەروەردگارو پەرستراوی هەموو بەشەرو جندو فریشتەکانیشە! دیارە ئەوەش وا لەتۆ دەکا کەدڵنیابی تۆیەکی مسوڵمانو ئەوی دیکەی نەصرانییو، ئەوی دیکەی جوولەکەو، ئەوی دیکەی عەلمانییو، ئەوی دیکەی زەردەشتیو ئاگرو داروبەردو مشكو مارو مانگا پەرستو، ئەوی دیکە کەهیچ فیکرەو بیروبڕوایەکی ڕوونی نیە، هەموومان بەندەی خواینو خواش پەروەردگارو بەدیهێنەرو مشوورخۆری هەر هەموانە، وە ئەم ژیانەی داناوە تاکو هەموومان پێیدا ڕەت بینو ئەم قوناغە تێپەڕێنین!

## بنەمای دووەم: بەشەرییەت هەمووی یەك خێزانە:

ئێمە وەك چۆن هەموومان دروستكراوی یەك خواین بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوەو لە كارگەی یەك بەدیهێنەرەوە هاتووین، هەمووشمان لە چوارچێوەی یەك خێزان داین، خوا -سبحانه وتعالى- دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾ الحجرات، واتە: ئەی خەڵكینە! ئێمە ئێوەمان لەنێرومێ یەك دروستكردوە، وەگێڕاومانن بەچەند گەل‌و تیرەیەك تاكو یەكدی بناسن، بێگومان بەرێزترتان لەلای خوا پارێزكارترتانە، بەڕاستی خوا زانای شارەزایە.

جا ئایا ئەوە چ هەستێك لە ئینسانی مسوڵماندا پەیدا دەكا؟! بێگومان ئەو هەستە لەتۆدا پەیدا دەكا كە تۆ لەگەڵ سەرجەم مرۆڤەكاندا خاوەنی یەك نەسەب‌و پشتن (علي بن أبي طالب)یش خوا لێی ڕازی بێ لەو بارەوە قسەیەكی جوانی هەیە، دەڵێ: (الناس إما أخ لك في الدين أو نظير لك في الخلق)، واتە: خەڵك یان براتن لەدیندا یان وەك تۆن لە دروستكراندا، یانی وەك تۆ مرۆڤن، بەڵێ لەسایەی ئەم ڕاستییەوە هەست بەوە دەكەین كە هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ یەك دایك‌و باب، من زۆرجار كە خەڵكی نامسوڵمان لەجوولەكەو نەصرانیی‌و خەڵكی دیكە دێن بۆلام، پێیان دەڵێم: گرنگ ئەوەیە ئێمە لە (ئادەم و حەووا)دا هەموومان پێك دەگەینەوەو دەبینەوە بەخوشك‌و براو بە ئەندامانی یەك خێزان، چونكە باب‌و دایكی هەموومان (ئادەم و حەووا)ن صەلات‌و

سەلامی خوایان لەسەربێ، ڕەنگە هەندێك کەس بڵێ: جا هەموو کەس ئەوە دەزانی! بەڵام نەخێر وانیە، بۆ نموونە: هەندێك لە ئایینە هیندییەکان خەڵك دابەش دەکەن بۆ سێ چین، هەروەها یۆنانییەکانیش بەهەمان شێوە، وەك لەکۆماری ئەفلاتووندا هاتوە دەڵێ: خەڵکیش وەك کانزایەکانن وەك چۆن کانزا زێڕو زیوو ئاسنو فافۆنو هتدی هەیە، مرۆڤەکانیش ئاوا دابەش دەبنو توێژو جۆری جیاجیایان هەیە![1]

بەڵام ئیسلام دەڵێ: مرۆڤەکان هەموویان لەیەك دایكو بابن، بەڕەشو سپیو جوانو ناشیرینو کورتەبالاو بالا بەرزەوەو بەعەرەبو غەیرە عەرەبەوەو، بەهەموو زمانو ڕەنگو شێوەکانیانەوە، هەروەها لە سەرەتای سووڕەتی (النساء)یشدا خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ النساء﴾، واتە: ئەی خەڵکینە! پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن کەلە یەك جۆرە نەفس دروستی کردوون، وەهەر لەخۆیشی هاوسەرەکەی بۆ دروستکردوە، پاشان لەو نێرو مێیە (کە لە یەك جۆرە نەفس دروست بوون) پیاوانو ئافرەتانێکی زۆری بڵاوکردۆتەوە لە زەویدا، جا پارێز لەو پەروەردگارەتان بکەن کەداوای پێ لەیەکدی دەکەن، وە پارێزیش لە خزمایەتی تان بکەنو مەی پچڕێنن! بێگومان خوا بەسەرتانەوە چاودێرە.

---

1) شایانی باسە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: **((تجدون الناسَ معادنَ كمعادن الذهب والفضَّة...))** متفق عليه، بەڵام دوایی ڕوونی دەکاتەوە کە مەبەستی خەسڵەتەکانیانە، نەك پیشەو کارو چینو توێژەکانیان، وەك ئەفلاطون!

كەواتە تۆیەكی مسوڵمان لەگەڵ ئەوی دیكەی نامسوڵمان، هەر جۆرە بیروباوەڕێكی هەبێ سیلەی ڕەحمو پەیوەندی خزمایەتیتان پێكەوە هەیەو دەچنەوە سەر یەك دایكو باب!

ـ كەواتە مامۆستا ئەم دوو بنەمایە بناغەی گەڕانن بەدوای خاڵی هاوبەشی زیاتردا، وەك یەك پەروەردگاریی و یەك خێزانیی؟

+ بەڵێ.

## بنەمای سێیەم: هەموومان بۆ یەك حیكمەتو ئامانج دروستكراوین:

خوا ـ سبحانه وتعالى ـ دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ الذاريات﴾، واتە: (ئادەمیزادو جندم تەنیا بۆ ئەوە دروستكردوون بمپەرستن)، بەڵێ هەموومان بۆ یەك حیكمەتو ئامانج دروستكراوین كە بریتیە لە بەندایەتی كردن بۆ خوا، بەندایەتییشمان بۆ خوا لە پیادەكردنی شەریعەتەكەیداو لەپێوەپابەندبوونیدا بەرجەستە دەبێ، ڕەنگە یەكێك بپرسێ: باشە ئەو شەریعەتەی خوا ئەگەر كەسێك پێیەوە پابەند نەبوو مانای وایە ئەو ئامانجەی نەهێناوەتە دی، ئایا ئەوە پاساو دەداتە دەستی مسوڵمانان كە دژایەتیی بكەن؟ ئەوە دوایی باسی دەكەین كە بێگومان نەخێر، چونكە ئەنجام وەرگرتنەوەی ئەو بەندایەتییە كێ دەیكات كێ نایكات، كێ بەڕاست یان بەهەڵە دەیكات؟! لەدوا ڕۆژداو لەلایەن خوای تاكەوە وەردەگیرێتەوەو ژیانی دنیا جێگای تێدا تاقیكردنەوەو جەڕبێنرانی مرۆڤەكانە، نەك شوێنی پاداشتو سزا درانەوەو تەصفیەی حیساب، وەك لەبنەمای چوارەمدا باسی دەكەین.

## بنەمای چوارەم: ژیانی دنیا جێگای تێدا تاقیکردنەوەیە:

خوا -سبحانه وتعالی- لەچەند شوێنی قورئاندا ئەم ڕاستییە دەخاتەڕوو، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ الملك﴾، واتە:(خوا ئەو کەسەیە کە ژیان و مردنی هەڵخستوونو هێناونە کایە، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە، وەئەو زاڵی لێبوردەیە)، کەواتە: ئێمە بۆ تاقیکرانەوە دروست بووینو دەبێ هەموو کەس مەجالی هەبێ تاقی بکرێتەوەو نابێ ڕێی لێبگیرێ تاقیکرانەوە (إمتحان)ی خۆی بدات، وەك قوتابییەك کەدەچێتە هۆڵی تاقیکردنەوەوە، قەڵەمو دەفتەری دەدرێتە دەستو کاتێکی دیاری کراویی بۆ دادەنرێ، لەگەڵ شوێنێکی گونجاو و پرسیارەکانیشی دەخرێنە بەردەم، ئەوە بۆ هەمووان وەك یەك وایە، بەڵێ بەڕاستی ئەم ژیانی دنیایە هۆڵی تاقیکردنەوەیەو دەبێ بۆ هەموومان وەك یەك بێ، وە دەبێ کەشو هەوایەك فەراهەم بێ کە هەر کەسە بتوانێ تاقیکردنەوەی خۆی تێدا ئەنجام بدات، جا ئەوەی دەکەوێ یان دەردەچێ، وە ئەوەی وەڵامەکان بەڕاستی دەداتەوە، یاخود بەهەڵە! واتە مرۆڤەکان ئازادن چۆن بیردەکەنەوەو چۆن دەژین لەسەر بیروبڕوایەك کە هەیانە!

من جاری دیکەش گوتوومە، وەك لە کتێبی (تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان)دا باسم کردوە، لە ئیسلامدا ڕێگەی بێ بڕوایی (کفر) دراوە، بەڵام ڕێگەی زوڵم نەدراوە، خوای

پـــەروەردگار دەفـــەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ...﴿٢٩﴾ الكهف ﴾، واتە:(پێیان بڵێ: حەق لە پەروەردگارتانەوەیە كێ حەز دەكات بائیمان بێنێ، وەكێ حەز دەكات با كافر بێ)، كەواتە: ڕێگای كافربوون دراوە، دیارە خوا لەسەر مرۆڤەكانی پێویست كردوە كە ئیمان بێنن وەك شەرع، بەڵام زەختو زۆری لێیان نەكردوە كە دەبێ حەتمەن ئیمان بێنن، وەڕێگای نەداوە بە شەریعەتەكەشی كە لەسەر ئیمان هێنان زۆرییان لێ بكات، بەڵێ ئیسلام ڕێی كافربوونی داوە، بەڵام ڕێی ستەمكردنی نەداوەو نەیفەرمووە: (فمن شاء فلیعدل ومن شاء فلیظلم)، واتە: كێ حەزدەكا بادادگەریی بكاو، كێ حەز دەكا باستەم بكات، چونكە كاتێك بەشێك لە خەڵك ئیمان دێنێو بەشێكی كافر دەبێ، دەتوانن پێكەوە بژین! بەڵام كاتێك یەكێكیان زاڵم دەبێو ئەوی دیكەیان مەزڵووم، ناتوانن پێكەوە بژین، چونكە زوڵم ڕێگە لە پێكەوە ژیان دەگرێ، بەڵام كوفر ڕێگای لێناگرێ! زانایانی ئیسلامیش جوانیان گوتوە: (قد یدوم الملك مع الكفر ولا یدوم مع الظلم)، بەڵێ لەگەڵ كوفردا دەستەڵات بەردەوام دەبێ، ئەوەتا دەوڵەتانی كافر هەنو دەستەڵاتو حوكمڕانییان بەردەوامە، بەڵام لەگەڵ زوڵمدا بەردەوام نابێ، با خۆیشی بەمسوڵمان بزانێ!

وە ئیسلامیش بەر لەهەر بەرنامەیەك زوڵمو ستەم قەدەغە دەكات، خوای پەروەردگار كە بەسەرهاتی (ذوالقرنین)مان بۆ دەگێڕێتەوە لە سوورەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿...قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمۡ حُسۡنٗا ﴿٨٦﴾ الكهف ﴾، واتە: گوتمان ئەی (ذوالقرنین) بۆت هەیە ئەو خەڵكە سزا بدەی لەسەر هەڵەكانیان، وە بۆشت هەیە چاكەیان لەگەڵدا

بكەی)[1] ئینجا دوای ئەوەی خوا عزوجل بۆ چۆنیەتی حوكمڕانیی كردن سەرپشكی دەكات، (ذوالقرنین) دەڵێ: ﴿ أَمَّا مَنْ ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُكْرًا . وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاءً الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا﴾ الكهف -87-88، واتە: ئینجا هەر كەسێك ستەم بكات ئێمە سزای دەدەین، دوایی (لەقیامەتدا) دەگەڕێتەوە لای پەروەردگاری لەوێش خوا زۆر خراپ سزای دەدات (لەسەر زوڵمەكەی)، وە ئەوەی ئیمان بێنیو كردەوەی باش بكات خوا پاداشتی هەرەچاكی دەداتەوەو ئێمەش قسەی خۆشی بۆ دەكەین (هانی دەدەینو دەستخۆشیی لێ دەكەین).

لێرەدا دەبینین ( ذوالقرنین) چ جۆرە سیاسەتێك دادەڕێژێ بۆ هەڵسو كەوتو مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو خەڵكەدا؟ هەستاوە بەراوردی كردوە لەنێوانی زوڵمو ئیماندا، نەك لەنێوانی كوفرو ئیماندا، نەیفەرمووە: (أما مَنْ كَفَر فسوف نُعَذِّبه)! بەڵكو فەرمویەتی:(أمّا من ظَلَمَ) ئەوەی زوڵم بكات سزای دەدەین، بەڵام ئەوەی كافربێ (ذوالقرنین) حەقی بەسەریەوە نیە![2] چونكە لە پێش (ذوالقرنین)دا خوای بەدیهێنەر ڕێگای داوە كە بەندەكانی بۆ خۆیان ڕێی خۆیان هەڵبژێرنو سەر پشكن بەكام ڕێدا دەڕۆنو هەڵوێستیان لەبەرانبەر پەروەردگاریاندا چۆن دەبێ، بەندایەتی بۆ دەكەن یان بۆی ناكەن؟!، جا مادام خوا بۆ خۆی ئەو مافەی پێداون، هیچ كەسێك بۆی نیە ئەو مافەی كە خوا بەبەندەكانی خۆی داوە، ئەو مافەیان

---

1) من لە كتێبی (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا بەدرێژیی ئەو باسەم هێناوە لە بەراوردی نێوان: جیهانداریێتی(عالمیة)ی ئیسلامو جیهانگیریی (عولمة)ی ڕۆژئاوادا.

2) واتە: وەك فشار خستنە سەرو سزادان، ئەگەرنا بانگەوازو تێگەیاندن هەر هەیە.

لێ زەوت بکات، کەواتە: ژیانی دنیا شوێنی تێدا تاقیکردنەوەیەو دەبێ هەمووکەس دەرفەتی تاقیکردنەوەی هەبێ‌و دەرفەتی هەبێ بەشێوەیەکی ئازادانە تاقیکردنەوەی خۆی ئەنجام بدات.

## بنەمای پێنجەم: خوا عزوجل بەویستی خۆی خەڵكی دابەش كردوە بۆ كافرو مسوڵمان:

بێگومان ئەوەش بنەمایەكی دیكەی زۆر گرنگە، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التغابن)دا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ التغابن﴾، واتە: (خوا) ئەو كەسەیە كە ئێوەی دروستكردوە جا هەتانە كافرەو هەشتانە ئیمانداره، وە خوا بەوەی دەیكەن بینایە)، لێرەدا وەك دەبینین كافرەكەی پێشخستوە! یانی خوای بەدیهێنەرو كاربەجێ بۆ خۆی ئیجازەی داوە خەڵك كافر بێ!

هەروەها خوا -سبحانە وتعالی- دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ .... ﴿١١٩﴾ هود﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای خەڵكی هەموو دەكردە یەك كۆمەڵ، بەڵام بەردەوام دەبن لەسەر جیاوازییەكانیان -هەیە ئیمان دێنێ و هەیە ئیمان ناهێنێ- مەگەر ئەوەی خوا بەزەیی پێدا بێتەوەو ڕێنمایی بكات، وەهەر بۆ ئەوەش دروستی كردوون.

(قرطبي)[1] دەڵێ: توێژەرەوانی قورئان هەندێكیان دەڵێن: (ولذلك خلقهم أي: وللإختلاف خلقهم)، واتە: بۆیە دروستی كردوون كە جیاجیابن!

---

1) الجامع الأحكام القرآن، ج9، ص94، كە گوتوویەتی: (قال الحسن ومقاتل وعطاء و يمان: الإشارة للأختلاف، أي: وللإختلاف خلقهم).

دەنا خوای بەدیهێنەر دەیتوانی هەموویان وەك فریشتەكان دروست بكات، كە تەنیا خوا پەرست بن، خوا -سبحانە وتعالی- ویستی وابووە مەخلووقێك دروست بكات كە بەئیرادەی خۆی بەرێدا بڕوات‌و ئازاد بێ، هەندێكیش لە زانایان دەڵێن: (ولذلك خلقهم) واتە: بۆیە دروستی كردوون كەبەزەیی پێیاندا بێتەوە، بەڵام ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر خۆیان كە خۆیان وا لێبكەن شایستەی ئەوەبن خوا بەزەیی پێیاندابێ‌و هیدایەتیان بدات، بەڵام ئەگەر خۆیان وا لێنەكەن شایستەی ئەوە بن، ئەوە ئەوكاتە لەدنیادا خۆیان لەبەزەیی خوا بێبەش دەكەن‌و، لەدوا ڕۆژیشدا دیارە سزای ئەو هەڵبژاردنە خراپەیان وەردەگرنەوە.

- ماموستا! دەربارەی قەزاو قەدەر هەر چەندە درێژەی دەوێ، بەڵام ئەگەر بەكورتی بەڕێزتان وەڵامێكی سەرپێییتان هەبێ بۆ ئەو پرسیارە كەنەبادا بینەرێك وا لێ حاڵی بێ كە مادام خوا ڕێگای داوە كافر بێ، كەواتە: ڕێگەیەكی مەشرووعە، خوا ئیرادەی لەسەر بووە كە ئەو بە كافری دروست بێ، یان ڕێگایەكی نا مسوڵمانانە بگرێتەبەر لە ژیاندا؟

+ خوا -سبحانە وتعالی- لە سوورەتی (الأنعام)دا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ١٤٨ قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُۖ فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ١٤٩ الأنعام﴾، واتە: هاوبەش دانەرەكان دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای نە ئێمە

نە باب‌و باپیرانمان هاوبەشمان بۆ خوا دانەدەنا، وەبەبێ ویستی خوا هیچ شتێکیشمان قەدەغە نەدەکرد (کەواتە: ئێمە کە هاوبەشمان بۆ خوا داناوە وە هەندێك شتمان لەخۆمان قەدەغە کردوە، ئەوە بەویستی خوایە، مادام بەویستی خوایە دیارە شتێکی باشە، مەبەستیان ئەوەیە کە شتێکی ئاوا بڵێن!) خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ئەوانی پێش ئەوانیش هەر ئاوا دینی خوایان بەدرۆ زانی هەتاکو سزای ئێمەیان چێژت، بڵێ: ئایا لەو بارەوە زانیاریتان لایە بۆمان دەربخەن؟!

ئێوە تەنیا دوای گومان دەکەون‌و تەنیا درۆش دەکەن، تۆ پێیان بڵێ: بەڵگەی هەرە تەواو هی خوایە ئەگەر ویستبای هەمووتانی هیدایەت دەدا واتە: (لو شاء مشيئة إجبار) ئەگەر ویستبای زۆرتان لێ بکات، دەیتوانی هەمووتان هیدایەت بدات، بەڵام نەیویستوە زۆر (جبـر)تان لێ بکات، بەڵکو ویستوویەتی ئازاد بن، ئینجا کە ئازادی کردوون، هەتانە کوفرو هاوبەش پەیداکردنی بۆ خوا هەڵبژاردوەو، هەتانە ئیمان‌و خوا بەیەکگرتنی هەڵبژاردوە!

کەواتە: خوا -سبحانه وتعالى- دوو سیفەتی هەن، ویستی (ارادة مشيئة) هەیەو ڕەزامەندیی (رضاء)ی هەیە، جا هەندێك کەس وەك چۆن هاوبەش پەیداکەرەکان لێیان تێکەڵ بووە، ئەویش هەر لەسەر ڕچەی ئەوان دەڕوات‌و لێی تێکەڵ دەبن، بەڵام دیارە ئەو دوو سیفەتە لەیەك جیان، ویست‌و خواستی خوا ڕەها (مطلق)یەو هیچ شتێك لە ژێر ڕکێفی خواست‌و ویستی خوا دەرناچێ، خواست‌و ویستی خوا وەك ئاسمان وایە تۆهەرچی بکەی لەژێر ئاسمان دەرناچی، بەڵام ڕەزامەندیی خوا

**لەگەڵ شەریعەتەکەی دایە، هیچ شتێك بەبێ خواستو ویستی خوا نابێ، بەڵام مەرج نیە هەموو شتێك بەڕەزامەندیی خوا بێ، خوا دەفەرموێ: ﴿...وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ...﴾ الزمر، واتە: خوا ڕازی نیە بەندەکانی کوفر هەڵبژێرن، بەڵام ئەگەر شوکرو سوپاسی بکەن لێتان ڕازی دەبێ، کەواتە مەرج نیە هەرشتێك بەویستو خواستی خوا بوو، ڕەزامەندی خوای لەسەر بێ! بابای کافر کافر دەبێ بە ئیرادەی خوا، بەڵام ڕەزامەندیی خوای لەسەر نیە، چونکە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ﴾ خوا ڕازی نیە عەبدەکانی کافر بن، دیارە هیچ کەسێکیش ناتوانێ ویستو خواستی خوا بکاتە بیانوو بۆ ئەوەی کەڕێی هەڵەو کوفر دەگرێ، چونکە وێڕای ئەو ویستە گشتیە کە هی خوایە، ئێمەش خۆمان ویست (إرادة)ێکی (جزئي)ی خۆمانمان هەیە: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ التكوير، ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾﴾ المدثر ئێمەش خواست (مشيئة)مان هەیە، بەڵام خواستو ویستی ئێمە لەژێر کۆنترۆڵی خواستو ویستە گشتیەکەی خوا دایە، واتە: خوا بەویستە گشتیەکەی خۆی ئەم ویستەی داوە بەئێمە، کە دەتوانین کوفر یان ئیمانی پێ هەڵبژێرین!**

## بنەمای شەشەم: خوا –سبحانه وتعالى– سزاو پاداشتی كوفرو ئیمان‌و خراپەكاریی‌و چاكەكاریی، هەڵگرتوە بۆ دوارۆژ:

بێگومان ئەوەش بنەمایەكی گرنگە لەو بنەمایانەی كە ئیسلام ڕەچاوی كردوون بۆ تەبایی‌و پێكەژیان‌و ڕەخساندنی كەش‌و هەوایەك كە خەڵك تێیدا تەبایی‌و پێكەوە ژیانێكی هاوبەش هاوكارانەیان هەبێ، وەك خوا –جل شأنه– لە چەندین شوێنی قورئاندا باسی كردوە، بۆ وێنە فەرموویەتی: ﴿وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾﴾ الحج، واتە: ئەگەر شەڕە قسەیان لەگەڵ تۆ –ئەی موحەممەد ﷺ– كرد، بڵێ: خوا دەزانێ ئێوە چی دەكەن، خوا لە ڕۆژی دواییدا دادوەرییتان لە نێواندا دەكات لەوەدا تێیدا دەكەوتنە ڕاجیاییەوە.

دیسان هەر لەو سوورەتەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾﴾ الحج، واتە: بێگومان ئیمانداران –مسوڵمانان– وە جوولەكەكان وە صابیئەكان وە نەصڕانییەكان وە مەجووسییەكان وە ئەوانەی هاوبەشیان (بۆ خوا) پەیدا كردوە، خوا لە ڕۆژی دواییدا دادوەرییان لە نێواندا دەكات‌و لێكیان جیادەكاتەوە، بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێكەوە چاودێرە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿... فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾﴾ الرعد، واتە: تۆ گەیاندنی پەیامی خوات لەسەرە بەڵام لێپرسینەوەیان لەسەر ئێمەیە.

وە لەڕاستیدا ئەو بنەمایە دەبێتە هۆکارێکی گرنگ بۆ مسوڵمانان کە لەگەڵ غەیری خۆیاندا چاوپۆشیی بکەنو گونجاو بن، بۆچی؟ چونکە تەنیا خوا دادوەریی لەنێوان بەندەکانیدا دەکاتو لە ڕۆژی دوایی‌دا (کا)و (دان) لێکجیادەکرێتەوەو لەوێ (تصفية الحساب) دەکرێو هیچ کەس بۆی نیە لە دنیادا ئەو حیسابو کیتابە لەگەڵ خەڵکدا بکات! دیارە پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام) پەیامی خوایان بەخەڵك گەیاندوە، بەڵام لەسەر ئەوە کە یەکێك پەیامی خوای قبووڵ نەکردبێ نەچوون سزای بدەن، چونکە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ڕاگەیاندنیان لەسەر بووە، بەڵام سزاو لێپرسینەوە لەسەر خوایە.

## بنەمای حەوتەم: مرۆڤ لەلای خواوە ڕێز لێگیراوە:

لەوبارەوە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ الإسراء﴾ لێرەدا خوا (جل شأنه) چەند حەقیقەتێك ڕوون دەکاتەوە دەربارەی وەچەی ئادەم بە گشتی کە دەفەرموێ: (بێگومان ئێمە ڕێزمان لە وەچەی ئادەم –بەگشتی- گرتوە، وە لە وشکانیو لە دەریادا هەڵمانگرتوون- ئامڕازی وامان بۆ ڕەخساندوون کە بتوانن لە وشکانیو دەریادا هاتووچۆی پێبکەن- وە لە بژێوە پاكو چاكو بەتامو چێژەکان بەشمان داون، وەبەسەر زۆر لە دروستکراوەکاندا بەرزمان کردوونەتەوە، واتە: شتێکمان بە وەچەی ئادەم داوە کە بە دروستکراوەکانی دیکەمان نەداوە، وەك لە کۆتایی سوورەتی (الاحزاب)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ....﴿٧٢﴾ الأحزاب﴾، واتە: ئێمە سپاردەی خۆمانمان ڕانواند لەسەر ئاسمانەکانو زەویو شاخەکان، کەچی ترسانو نەیانتوانی هەڵیبگرن، بەڵام ئینسان هەڵیگرت)، کەواتە: ئینسان شتێکی پێ سپێردراوە کە بە هیچ کام لە دروستکراوانی دیکەی خوا نەسپێرراوە!

هەڵبەت ئەم ڕێز لێگیراوێتییەی ئینسان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بەگشتی بۆ هەموو مرۆڤەکانە، نەك هەر بۆ ئیمانداران، وەك چۆ هەڵگرتنیان لە وشکانییو لە دەریادا بۆ هەموانە، وە وەك چۆن دابینکردنی بژێوە پاكو چاكو بەتامو چێژەکان بۆ هەموانە، هەروەها وەك

چۆن بەرزکرانەوەی ئینسان بەسەر غەیری ئینسانندا بۆ هەموو ئینسانەکانە، بەهەمان شێوەش ڕێزلێگرتن (تکریم)ەکەش بۆ هەمووانە بەبێ جیاوازیی.

لە فەرمایشتێکی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: عن ابن عباس (رضي الله تعالى عنهما) **مروا على النبِي ﷺ بـجنازة فقام لها واقفاً، فقالوا يا رسول الله انها جنازة يهودي، فقال: أليست نفساً؟!)** رواه البخاري، واتە:جەنازەیەکیان بەلای پێغەمبەردا ﷺ هێنا، ئەویش بۆی هەڵسایە سەرپێ‌و ڕاوەستا -وەك ڕێز لێگرتن- گوتیان: ئەی پێغەمبەر خوا ﷺ ئەوە تەرمی جوولەکەیەکە! فەرمووی: ئەدی نەفس نیە؟! (واتە ئینسان نیە؟!) ئەوە کە کاتێك تۆی مسوڵمان وە مسوڵمانان دەزانن کەئینسان وەك ئینسان لای خوا ڕێزو حورمەتی لێگیراوە، مانای وایە ئەو ئیمان‌و عەقیدەیە پاڵ بەتۆوە دەنێ کەڕێز لەهەموو ئینسانێك بگری، ئیدی چاوپۆشی لەوە بکە چ بیروڕاو دین‌و ئایدیایەکی هەیە، ئینسان وەك ئینسان ڕێزی لێگیراوە، سەرنج بدە کە پێغەمبەر (لوط)(عليه الصلاة والسلام) کاتێك لەگەلەکەی تووڕە دەبێ‌و لەگەڵیان تێك دەگیرێ دەڵێ: ﴿... إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ الشعراء﴾، واتە: وە بێگومان من ڕقم لە کردەوەکەتانە) نالێ: ڕقم لە خۆتانە! ڕقی لەخۆیان نیە، چونکە خۆیان وەك ئینسان ڕێز لێگیراون لەلایەن خواوە، وە لە چاکترین شێوەدا دروست کراون، وەك دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ التين﴾ چۆن مەخلووقێك خوا ڕێزی لێ بنێ‌و لە باشترین شێوەدا دروستی بکات‌و گرنگترین ئەرکی پێ بسپێرێ لەبووندا، تۆ چۆن بەکەم تەماشای دەکەی؟! نەخێر، بەڵام ڕقمان لە کردەوەو بۆچوونی خراپ‌و شتی هەڵەیە، چ هی خۆمان بێ، چ هی ئەوانی دیکە.

## بنەمای هەشتەم: پێغەمبەران هەموویان بۆ چەسپاندنی دادگەریی هاتوون

شەریعەتی ئیسلام گرنگیی زۆری بەدادگەریی داوە، لەگەڵ دۆستو دوژمنو لە حاڵەتی جەنگو ئاشتیدا، خوای دادگەر لە ئایەتی ژمارە –25-ی سوورەتی (الحديد)دا دەربارەی ئەوە کە ئامانجی هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بریتی بووە لە چەسپاندنی دادگەریی بەمانای فراوانی چەمکی دادگەریی، دەفەرمویٚ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ ...﴿٢٥﴾ الحديد﴾، واتە: ئێمە هەموو پێغەمبەرانی خۆمانمان بە بەڵگە ئاشکراکان (معجزات)ەوە ناردوە، وە کتێبو تەرازووشمان پێدا ناردوون، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچیٚ، واتە: هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هاتوون کە مرۆڤ لەسەر زەوی دادگەرانە بژی لەڕووی سیاسی، ئابووریی، کۆمەڵایەتییو هەموو ڕەهەندەکانی دیکەی ژیانەوە.

هەروەها خوا ـ جل شانە ـ لە چەند شوێنی قورئاندا فەرمان بە مسوڵمانان دەکات کە دادگەر بن، بۆ وێنە دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا

تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ المائدة﴾، واتە: ئەی ئیمانداریـنە بۆ خوا هەڵسن‌و شایەدیی بەدادگەریی بدەن، وە با ڕق لێبوونـەوەتان لەکەسـانێك واتـان لێنـەکات نادادگەربن ـ بەڵکو ئەگەر دوژمنیشتان بن هەر لەگەڵیان دادگـەربن ـ دادگەربن لەگەڵ هەموو لایەکدا ئەوە لەتەقواوە نزیکترە، وەپـارێز لـەخوا بکەن بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە.

واتە: کەتۆ دەتەوێ ئەهلی تەقواو پارێزگاربی دادگەربە، هەروەها خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ کە بەخـەڵك بڵـێ: ﴿...وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ...﴿١٥﴾ الشورى﴾، واتـە: (وە فـەرمانم پێکـراوە دادگـەرییتان لەنێودا بچەسپێنم)، دیارە لای کەمی دادگەریش ئەوەیە ئـەوەی بـەخۆتی ڕەوا دەبینی بەخەڵکیشی ڕەوا ببینی، وە دادگەریی ئەوەیە کـە خـەڵك لـە هەل‌ومەرجەکانی ژیاندا یەکسان بێ‌و کەس ئاغاو کۆیخا نـەبێ بـە سـەر ئەوی دیکەوە، وە دادگەریی ئەوەیە ئەوەی بۆ خـۆتی بەچـاك دەزانـی، بـۆ خەڵکیشت پێ چاك بێ‌و، ئەوەی بۆ خۆتت پێ خراپە، بۆ خەڵکیشـت پـێ خراپ بێ، ئیدی چاوپۆشیی بکە چ بیروبڕواو ئاینێکیان هەیە.

- مامۆستا ئەگەر ئەم سیفەتی دادگەرییە لەناو گەل‌و خەڵکێکـدا هاتـە دی کە مسوڵمانیش نەبن، یەکێك لە ئامانجەکانی ئینسانی مسـوڵمان نەهاتۆتە دی؟

+ بەڵێ بێگومان یەکێك لە گەورەترین ئامانجەکانی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هاتۆتە دی، بەڵام ئێمـە بـە هـەموو قەناعەتێکـەوە دڵنیـاین کـە تـەنیا لەسـەر بناغـەی پیـادەکردنی شـەریعەتی خـوا، دادگەریی تـەواو دێتـە دی، ئەگـەرنا تەماشـای وڵاتـانی ڕۆژهـەڵات‌و

ڕۆژئاوا بکە، هەموو ئەوانەی سیستەمی غەیرە ئیسلامییان هەیە، دادگەرییەکەیان بۆ خۆیانەو تەنیا لەنێو خۆیاندا پیادەی دەکەن، بەڵام لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیان دیکتاتۆرنو خۆسەپێنو داگیرکەرن، بە بەڵگەی ئەوەی کە دێت وڵاتت داگیر دەکات دەتکوژێو قەتلعامت دەکات، دوایی داوای خوێنو قەرەبوو دەکەی ئەوەشت بۆ ناکات! بۆ وێنە: ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان ئەمریکا خەڵکی لێکوشتینو دوایی چەندان جار من لە زیندانی ئەوانو، دوای ڕزگاربوونیشم داوامان لێکردن بۆمان قەرەبوو بکەنەوە، بەڵام گوێیان پێ نەداین!

بەڵام کاتێك لە ڕووداوی (لۆکەربی)دا دەوڵەتی (لیبیا) تۆمەتبار کرا کە ئەو فڕۆکەی ئەوانی خستۆتە خوار، دوایی بۆ هەر کوژراوێکی ئەمریکی نێو فڕۆکەکە (10) ملیۆن دۆلاریان داوا کرد! ئینجا ئەو هەموو تاڵانکارییو پاوانکارییو داگیرکارییەی کە زلهێزەکان کردوویانە، هەر لە بەریتانیاو فەرەنساو ئیتاڵیاو ئیسپانیاوە بگرە هەتا ئەمریکاو ڕووسیا، کە بێگومان هەر لە پەرلەمانەکانیاندا ئەو بڕیارانە دراون! کەواتە: بەڵێ ئەوان کۆمەڵێك کاری باشیان هەیە، بەڵام هەر بۆ خۆیانەو لە دەرەوەی سنووری وڵاتەکەی خۆیان لە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خەڵکی دیکەدا، ئەو بەهاو شتە باشانە پیادە ناکەن، بە پێچەوانەی مسوڵمانانەوە کاتێك کە دەوڵەتی ئیسلامیی هەبووەو دەسەڵاتی هەبوو ئەو شتە باشو بەهایانەی کە بۆ نێوخۆ بەکاری هێناون، پابەند بووە بەوەی کە لەگەڵ غەیری خۆشیدا هەر بەو ڕەوشتو بەهایانەوە ڕەفتارو مامەڵە بکات!

## بنەمای نۆیەم: تۆبزیی كردن و زۆرلێكردن لەدینداریيدا نیە:

خوا –جل شأنه- زۆر بە ڕوون و ڕاشكاویی دەفەرمویێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ...﴾ البقرة: ٢٥٦، واتە: تۆبزیی كردن و زۆرەملێ كردن نیە لە دیندا.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەبوو كە پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ كۆچ بكات بەرەو (یثرب- مەدینە) هەندێك لە تیرەی ئەوس و خەزرەج لەسەر خۆیان نەزر كردبوو، ئەگەر خوا كوڕی پێدان، كوڕەكەیان بكەن بە جوولەكە یان نەصرانیی، دەیانزانی كە ئەوان خاوەنی دینێكی ئاسمانیین و ئەوانیان پێ لە خۆیان دیندارو موبارەكتر بوو! ئینجا دوای چوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوێ، هەندێك لەو دایك و بابانەی كە كوڕەكانیان كردبوو بە جوولەكەو نەصرانی، دەیانویست وەك چۆن خۆیان مسوڵمان بوون، كوڕەكانیشیان بە تۆبزیی و زۆرلێكردن بگێرنەوە بۆ ئیسلام، جا ئەوەبوو كە خوای كاربەجێ ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ...﴾ البقرة: ٢٥٦، واتە: تۆبزیی كردن لە دینداریی‌دا نیە، ڕێی ڕاست و ڕێی چەوت لێك جیاكراوەتەوە، واتە: تازە بۆتان نییە كوڕەكانتان بە زۆر بكەنەوە بە مسوڵمان مادام دینێكی دیكەیان هەڵبژاردوە[1]!

بێگومان ئەمەش بنەمایەكی زۆر گەورەو گرنگەو وا لە ئینسانی

1) رواه أبو داود والنسائي، بڕوانە (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير)، ص 257، 258.

مسوڵمان دەكات هەرگیز نەتوانێ چاویش لە خەڵك سوور بكاتەوە لەسەر ئەوەی كە كافرەو غەیری ئیسلامیی بە بەرنامەی ژیان هەڵبژاردوە، چونكە ئەوە مافێكە خوا بە بەندەكانی داوەو كەس ناتوانێ زەوتی بكات.

لە جێگەیەكی دیكەدا خوا –سبحانه وتعالی- دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩﴾ یونس، واتە: وە پەروەردگارت ئەگەر ویستبای هەموو خەڵكی سەر زەوی ئیمانیان دەهێنا، جا ئایا تۆ تۆبزیی لە خەڵك دەكەی كە ئیمان بێنن؟! واتە: من خواو پەروەردگاریانم تۆبزییم لێنەكردوون، تۆش كە ڕەوانەكراوی منی بۆت نیە تۆبزییان لێ بكەی.

هەروەها خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ٢٢﴾ الغاشية، واتە: تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە، (بەزۆر بیانكەی بە مسوڵمان)، یان دەفەرموێ: ﴿... وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِجَبَّارٖۖ ... ٤٥﴾ ق، واتە: تۆ بۆت نیە جەبریان لێ بكەی.

## بنەمای دەیەم: بناغە لە هەڵسوکەوتی مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیاندا بریتییە لە ئاشتی:

واتە: لە بواری هەڵسوکەوتی نێوان مسوڵمانانو غەیری خۆیاندا، ئەسڵ تەبایی و ئاشتەواییە، نەك جەنگو تێکگیران! هەڵبەتە هەندێك لە زانایان لەوبارەوە مشتومڕیان کردوە، هەندێکیان گوتوویانە: ئەسڵ جەنگە، بەڵام ئەوە شتێکی زۆر نامەنتیقییە، چۆن تۆ هەر لە ڕێوە شەڕو جەنگ لەگەڵ بەرانبەردا دەکەیو سەنگەری لێدەگری بێ ئەوەی بزانیو تێبگات داخۆ چیت لێی دەوێ؟!

بێگومان ئەوە هیچ ڕاستو ڕەوا نیەو پێغەمبەر ﷺ جەنگی لەگەڵ هیچ تیرەو گەلێکدا نەکردوە تاوەکو بانگی نەکردبن بۆ دینی خوا، بەڵکو لە ڕاستیدا هەموو ئەو جەنگانەی پێغەمبەر ﷺ کردوونی بە دەست پێشخەریی بەرانبەرەکانی بووە، تەماشا دەکەین یەکەم ئایەتێك کە مۆڵەتیدا بە مسوڵمانان جەنگ بکەن، ئەم ئایەتەی سوورەتی (الحج)ە، کە دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ۝٣٩ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ ... ۝٤٠ الحج﴾، واتە: مۆڵەت درا بۆ ئەوانەی جەنگیان لەگەڵدا دەکریو ستەمیان لێکراوە کە بەرگریی لە خۆیان بکەن، وە خوا لەسەر سەرخستنیان بەتوانایە، ئەوانەی لە ماڵو حاڵی خۆیان وەدەرنران (دوژمنەکانیان) هیچ حەقێکیان لەسەریان نەبوو تەنیا ئەوە نەبێ کە دەیانگوت: پەروەردگارمان خوایە.

هەروەها لە سوورەتی (البقرة)شدا دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠﴾ البقـرة، واتە: وە لەڕێی خوادا بجەنگن لەگەڵ ئەو کەسانەی لە دژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، چونکە خوا دەستدرێژکارانی خۆش ناوێ) واتە: کەسێك کە لێتان دەگەڕێ ئێوەش لێی بگەڕێن مادام شەڕتان پێ نافرۆشێ!

- مامۆستا، واتە جەنگەکانی ئیسلامو مسوڵمانان زیاتر بەرگریی لەخۆکردن (دفاعي) بوون؟

+ ئەو بابەتێکی دیکەیە کە ئایا جەنگ لە ئیسلامدا تەنیا بەرگریی (دفاعی)یە، یاخود هێرش بردنە (هجومی)یشە؟! چونکە جاری وایە هێرشکردن باشترین وەسیلەیە بۆ بەرگریی لەخۆکردن، بۆ نموونە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەبیستێ کە ڕۆمەکان سوپایان کۆکردۆتەوەو خەریکی هێرش کردنن بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامیی، دیارە لەو حاڵەتەدا بەرلەوەی کە بەسەریاندا بدرێ، باشتر وایە پێغەمبەر ﷺ وەك تاکتیکی جەنگیی دەستپێشخەریی بکاتو بەسەریاندا بدات! دیارە پێغەمبەریش هەر وایکردو جەنگی تەبووك هۆکارەکەی ئەوەبوو، کەواتە جاری وایە هێرش بردن باشترین ئامرازە بۆ بەرگریی، بەڵام ئیسلام هیچ کاتێك ڕێگا بە مسوڵمانان نادات دەستپێشخەری جەنگ بن، بۆچی؟ چونکە لە ڕاستیدا ئیسلام ئامانجی خۆی بە ئاشتی (سلم) دێنێتە دی، بەڵام دوژمنانو ئەهلی باتیڵ ئامانجی خۆیان بە جەنگ تەحقیق دەکەن، ئەوان لە کەشو هەوای ئاڵۆزدا دەرفەت وەردەگرن، ئەگەرنا ئەهلی حەق پێویستییان بە جەنگو شەڕو ئاژاوەو ئاشووب نیە.

## بنەمای یازدەیەم: بنچینەی هەڵسوكەوتی مسوڵمانان لە چوارچێوەی كۆمەڵگای ئیسلامیی لەگەڵ نامسوڵمانان‌دا بریتیە لە چاكەكاریی:

واتە: ئەوانەی كە لەگەڵ مسوڵمانان لە سایەی دەوڵەتێكدا پێكەوە كۆدەبنەوە، لەوبارەوە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ الممتحنة﴾، واتە: خوا ڕێگاتان لێناگرێ لەگەڵ ئەوانەدا كە لەسەر دینتان لەگەڵتان نەجەنگاون، وە لەماڵو حاڵو نیشتیمانی خۆتان وەدەریان نەناون، كەچاكەیان لەگەڵ بكەن‌و لە ماڵو سامانی خۆتاندا هاوكارییان بكەن، بێگومان خوا بەخشەرانی خۆشدەوێ.

لێرەدا (المقسطين) بەمانای دادگەران (عادلين) نیە، بەڵكو بەمانای بەخشەران دێ، چونكە (أقسط إليه)، واتە: ماڵی خۆی دایەو بەش (قسط)ێك لەماڵی خۆی پێ بەخشی، وەك توێژەرەوانی قورئان دەڵێن، دیارە هەندێكیش هەر بەدادگەرییان لێك داوەتەوە، بەلاّم مانای یەكەم ڕاستترە، چونكە دادگەریی (عدل ـ قسط) بەها (قيمة)یەكی ڕەهایە لە هەموو حالاّنداو لەگەڵ هەموو كەسداو هەرگیز نەهی لێناكرێ!

- یانی بێجگە لەوەی لەسەر مسوڵمانان پێویستە دادگەربن، وێڕای ئەوە دەبێت چاكەكاریش بن.

+ بەڵێ دەبێ وێڕای دادگەریی چاكەكارییش بن، دیارەچاكەكارییش دوو

لای هەیە لەڕووی مەعنەوییو لەڕووی ماددیەوە، چونكە دەفەرموێ: ﴿... أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْۚ ... ﴿٨﴾ المتحنة﴾، لێرەدا (بَرَّ اليه، بَرَّهُ) واتە: چاكەی لەگەڵ كرد، لەڕووی مەعنەویەوە، پاشان (أقسط اليه) واتە: چاكەی لەگەڵدا كرد لەڕووی ماددیەوە! كەواتە: پێویستە مسوڵمانان لە چوارچێوەی كۆمەڵگای ئیسلامییدا لەگەڵ سەرجەم ئەو نامسوڵمانانەدا كە لەگەڵیان دەژین، لەڕووی مەعنەوەییەوە ڕێزیان بگرنو لەگەڵیان قسەخۆشو سەرو ڕووخۆش بنو بەمانای وشە لەگەڵیان چاكەكاربن، وە لەڕووی ماددییشەوە دەبێ دەستبارگرو هاوكاریان بن، بەڵام بەمەرجێك دژی دینو ژینیان نەبن، كاتێك كە دژایەتی دینو ژینت دەكرێ، مانای وایە سەنگەرت لێ گیراوەو ئەو كاتەش چاكە لەگەڵدا كردن هیچ مانای نامێنێ، بەڵام لەو حاڵەتەشدا دادگەریی هەر لەجێگەی خۆیەتی!!

ئینجا هەر لەوبارەوە سەرنج دەدەین خوای كاربەجێ لەسووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ النساء﴾، واتە: هەركاتێك سڵاوتان لێكرا بە سڵاوكردنێك، چاكتر لەخۆی، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك پارێزەرو بەتوانایە.

ڕۆژێك(ت) (الشعبِي) خوا لێی خۆش بێ لە وەڵامی سەلامی نەصرانییەكدا گوتی: (وعليك السلام ورحمة الله)، ئەوانەی لەگەڵی بوون گوتیان: سەلامی لێ دەكەی قەیناكات، بەڵام بۆچی ڕەحمەتی

1) (محاسن التأويل) للقاسمي، ج5، ص237.

خوای بۆ دەنێری؟! گوتی: خۆ ئەویش هەر لەڕەحمەتی خوادا دەژی! (واتە: ئەو بارانە دەبارێ بەسەر هەموو لایەكدا ڕەحمەتی خوایە، خوا لەشی ساغ كردوەو ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی لەگەڵدا كردوون، هەموویان هەر بەرهەمی ڕەحمەتی خوان)، خاوەنی تەفسیری (محاسن التأويل) لەوبارەوە گوتوویەتی:[1] (واستدلّ بها الجمهور على ردِّ السلام على كل مسلِّم مسلماً كان أو كافراً، لكن مختلفان في صيغة الرد)، واتە: زۆرینەی زانایان ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر ئەوە كە وەڵامی هەموو سڵاوكەرێك دەدرێتەوە مسوڵمان بێت یان كافر، بەڵام شێوازەكانیان جیاوازن، بەڵام من -واتە: عەلی باپیر- ڕام وایە كە لەبەر كوفرو ئیسلام شێوازی وەڵامدانەوەی سەلام ناگۆڕێت!

وەلە ڕاستیدا ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كەهەڵسوكەوتی ئێمە لەگەڵ غەیری خۆماندا، واتە: ئێمە وەك مسوڵمان لەگەڵ ئەوانەی خۆیان بە نامسوڵمان دادەنێن، پێویستە بەچاكتر لەهی خۆیان بێ، یان بەلای كەمەوە دەبێ وەك هی خۆیان هەربێ، ئەگەر ئەو جارێك سڵاوتان لێبكات دەبێ تۆ دووجار سڵاوی لێبكەی، وە دەبێ تۆ دەستپێشخەری سڵاو لێكردنو ڕێز لێگرتنی بیو، دەبێ هەوڵدەی تۆ لەو چاكتربی لەوەی ئەو بۆت چاكە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێكدا دەفەرموێ: **(اليد العليا خير من اليد السفلى)** رواه مسلم، واتە: (دەستی بەرز لەدەستی نزم باشترە) دیارە دەستی بەرز بەخشەرەو دەبێ

1) سەرچاوەی پێشوو، هەروەها بڕوانە: (الجامع الأحكام القرآن) للقرطبِي، كە گوتوویەتی: (واختلف في ردِّ السلام على أهل الذمة هل هو واجب كالردِّ على المسلمين؟!) وإليه ذهب ابن عباس والشعبِي وقتادة تمَسكاً بعموم الآية وبالأمر بالردِّ في صحيح السنة..)، ج5، ص266.

ئێمەی مسوڵمان ڕێزو قسەی چاكو هاوكاریی ببەخشین، بۆیەش خوای پەروەردگار بەشێوەیەكی ڕەها دەفەرموێ: ﴿... وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ... ﴿٨٣﴾ البقرة﴾، واتە: قسەی باش لەگەڵ خەڵك بكەن، وە دەفەرموێ: ﴿... وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ البقرة﴾، واتە: چاكە بكەن، بێگومان خوا چاكەكارانی خۆشدەوێ، وەك دیارە بەموتڵەقی فەرموویەتیو دیاری نەكردوە لەگەڵ كێ بیكەنو لەگەڵ كێش مەیكەن! وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **(ان الله تعالى كتب الإحسان على كل شيء)** رواه مسلم، واتە: خوا چاكەكردنی لەسەر هەموو شتێك نووسیوە.

كەواتە: پێویستە بەموتڵەتی مرۆڤی مسوڵمان چاكەكار بێ لەگەڵ مسوڵمانو نامسوڵماندا، دیارە ئەوە لەبواری هەڵسوكەوتدا، بەڵام بێگومان بواری بەرەنگاریی‌و ڕووبەڕووبوونەوەو شەڕ پێ فرۆشراندا، ئەوە بازاڕێكی دیكەیە!!

**بنەمای دوازدەیەم: هاوكاریی كردن لەگەڵ هەر لایەنێكدا بۆ هەر شتێكی چاك كە لە قازانجو بەرژەوەندیی هەموو لایەك دایە، واتە دەستبار بۆ یەكدی گرتن بۆ جێبەجێكردنی ئامانجە هاوبەشەكان:**

خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾ المائدة ﴾، واتە: ئەی بڕوادارینە! دروشمەكانی خوا مەشكێنن -هەڵیان مەوەشێننەوە- وە جەنگ مەكەن لە مانگە قەدەغەكراوەكاندا، وە ڕێ مەگرن لەو قوربانییانەی بەدیاری دەهێنرین -با لەلایەن هاوبەش پەیداكەرانیشەوە بێ وەڕێ مەگرن لەوانەش كە گەردن بەندیان لەمل كراوەو نیشانەدار كراون، وەدەست درێژیی مەكەنە سەر ئەوانەی نیازی ماڵی خوا دەكەن، وەكاتێك ئیحرامتان شكاند ڕاووشكار بكەن، وە ئەوكەسانەی كاتی خۆی ئێوەیان گێڕاوەتەوە لە مزگەوتی حەرام، مادام ئێوە ئێستا دەستەڵاتتان هەیە بارق بوونەوەتان لێیان واتان لێنەكات ئەوان بگێڕنەوەو دەستدرێژییان بكەنەسەر، وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكارییو پارێزكارییو هاوكاریی یەكدی مەكەن لەسەر گوناحو دەستدرێژكاریی، وەپارێز لەخوا بكەن بێگومان خوا تۆڵەی زۆر بەتینە.

لەم ئایەتەدا زیاتر مەبەستمان ئەم ڕستە قورئانیەیە کە دەفەرموێ: ﴿... وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ... ﴿٢﴾ المائدة﴾، کە لە سیاقێکدا هاتوە باسی هەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ کافرانداو خوا –عزو جل- بە ڕاشکاویی بە مسوڵمانان ڕادەگەیەنێ کە هاوکاریی کەسانێك بکەن کە هاوبەش دانەرن‌و بە ئیسلام ڕازی نین، هاوکارییان لەگەڵدا بکەن بۆ ئەنجامدانی هەر شتێك کەچاك‌و بەکەڵکە لەنێوان بەندەکاندا، وەهەر شتێکیش کەمایەی تەقواو پارێزکارییە لەنێوان بەندەکان‌و خوای پەروەردگاردا.

بەڵێ مسوڵمان دەبێ دەست پێشخەرو دەستبارگر بێ بۆ هاوکاری لەگەڵ هەرکەسێکدا کەبەرەو خێرو چاکەو خزمەت بەخەڵك هەنگاو دەنێ، گەلێك جار ڕێکخراوی خاچی سوورو ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ کە دیدارمان لەگەڵیان بووە، پێم گوتوون: ئێوە کارێك دەکەن کەچاکە دەخەنە چاوی هەموو ئینسانێکەوە، بەمەرجێك کارەکانتان بەڕاست‌و ساغی بێ‌و شتی دیکەی نابەجێی لەپەنادا نەکەن! چونکە بێگومان ئەوان نامەو زانیاری گیراوو بەندییەکان دەگەیەنن بەکەس‌و کاریان‌و کەل‌و پەل‌و پێداویستییان بۆ دابین دەکەن، وە بەرگریی لە ماف‌و ئازادییەکانی خەڵك دەکەن، ئەوانەش شتی ئینسانیین، ئێمەش وەك مسوڵمان‌و وەك ئیسلامیی هەرکەسێك هەنگاو بنێ بۆ بەختەوەریی خەڵك‌و کۆمەڵگاو هەوڵی دابینکردنی بەرژەوەندیی‌و ئاسایش‌و ئارامیی‌و قازانج بدات بۆ خەڵك، دەبێ دەستخۆشیی لێ بکەین‌و هاوکارو دەستبارگریشی بین، بەپێی واتای ئەو ئایەتە موبارەکەی قورئان.

## بنەمای سێزدەیەم: مادام ئیسلام تاکە بەرنامەی پەسندی خوایە دەبێ سێبەرەکەی جێی هەموو خەڵکی لەبن بێتەوە:

وەك خوا - جل شانه - دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ... ﴿١٩﴾ آل عمران ﴾، واتە: بێگومان بەرنامەی ڕاستو تەواو لەلای خوا بەس ئیسلامە، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ آل عمران: ﴾، واتە: وەهەر كەسێك غەیری ئیسلام بەبەرنامە بخوازێ لێی قبووڵ ناكرێو لە دوارۆژیشدا لە زیانمەندانە.

بەڵێ مادام بەرنامەو دینی ڕاست لای خوا تەنیا ئیسلامە، کەواتە: ئەم ئیسلامە دەبێ سێبەری هێندە فراوان بێ، جێگای هەموو کەسی لەژێر بێتەوە، ئەم دینە حەقە کەخوا بۆ قیامەت غەیری ئەوە لەکەس قبووڵ ناکات، بەڵام بۆ دونیا: ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ الكافرون ﴾، واتە: دینی خۆتان بۆ خۆتانو دینی خۆشم بۆ خۆم، هەڵبەتە بۆ قیامەت خوا تەنیا شوێنکەوتنی ئیسلام قبووڵ دەکات، چونکە هەر ئەو ئایینو بەرنامەی هەقو ڕاستە، بەڵام ئەو دینە حەقە ڕێگای داوە بەدینە ناهەقو باتیڵەکان کە ئازادبن، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە دەستووری عێراقدا هاتوە کە نابێ هیچ یاسایەك دەربچێ دژو پێچەوانەی شەریعەت بێ، لە بەرانبەر ئەوەدا هەندێك کەس کردوویانە

بەهاتو هاوار كە چۆن دەبێ وابێ! ئەدی دینەكانی دیكە؟ جا ئێمە لە وەڵامدا دەڵێین: برادەر! ئەم دینە حەقە ڕێگا دەدات بەبوونی دینە ناڕاستو هەڵەكانی دیكەش! چونكە خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ۝٦﴾ الكافرون، واتە: ئەی بێ بڕوایان! ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، وەئەوەی منیش دەیپەرستم ئێوە نایپەرستن، وە من پەرستەری ئەوەنەبووم كە پەرستووتانەو، ئێوەش پەرستەری ئەوە نەبوون كە پەرستوومە، دینی خۆتان بۆ خۆتان وەدینی خۆم بۆ خۆم.

بەڵێ تاكە ئایینی ڕاستو نەشێوێنراوی خوا (ئیسلام) ڕێگا بەدینە ناڕاستەكانی دیكەش دەدات، جا چ ئاسمانیی بنو دەستكاریی كرابنو گۆڕابن، وە چ مرۆڤكردو زەمینی بن، كە شوێنكەوتووەكانیان پەیڕەوییان لێ بكەن، كەواتە: ئیسلام كەتاقە دینی پەسندی لای خوای پەروەردگارە، دەبێ سروشتەكەی وابێ جێی شوێنكەوتووانی دینەكانی دیكەی لەژێر سایەدا ببێتەوە، لەكاتێكدا كە دەستەڵاتی دەبێ، ئینجا بێگومان كە سەیری مێژووی دەستەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامییش دەكەین هەروای دەبینین، چونكە هەموو كەمایەتیە دینییەكانو هەموو فیكرەو بیروباوەڕەكان لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دابوونو ئێستاش هەرماونو هەن!

## بنەمای چواردەیەم: خوا –سبحانه وتعالى– پێغەمبەری خۆی بە بەزەیی بۆ تێکڕای جیهانیان بە (رحمة للعالمين) پێناسە دەکات:

وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء، واتە: تۆمان نە ناردوە مەگەر بەزەیی بۆ تێکڕای جیهانییان، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: **(إني لم أُبعث لعّاناً وإنَّما بُعِثْتُ رحمةً)** رواه مسلم، واتە: بێگومان من بە نەفرینکەر نەنێرراوم، بەڵکو بە ڕەحمەت نێرراوم.

هەروەها فەرموویەتی: **(إنَّما أنا رحمة مهداةٌ)** رواه الحاكم وصحّحه ووافقه الذهبِي، واتە: بێگومان من بەزەییەکی خەڵاتکراوم (بە بەشەرییەت).

ئینجا باشە مادام پێغەمبەری خوا ﷺ بەزەیی بێ بۆ تێکڕای جیهانییان، مانای وایە دەبێ هەموو جیهانییان بتوانن لەژێر سایەی ئەو بەزەیی یەی خوادا هەم بەهرەمەند بن، هەم بژین، هەڵبەتە ژیانێکی ئینسانانەش بژین نەك هەر ژیانێکی کولە مەرگیو بە زەبوونیی، ژیانێك لە ئینسانێك بوەشێتەوە کە خوا بە جێنشینی خۆی لە قەڵەمی داوەو ڕێزی لێگرتوە، کەواتە: هەر خودی پێناسەی پێغەمبەر ﷺ بە (بەزەیی خوا بۆ جیهانییان) ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو ئیسلامەو ئەو پەیامە کە پێغەمبەرێکی نازناو (رحمة للعالمين) هێناویەتی، ڕێگا دەدات بە شوێنکەوتووانی هەموو دینو بیروباوەڕێك کە بە ئازادانە پەیڕەویی لێ بکەنو بەوەش دەتوانن پێکەوە بژین بە گونجاویی و تەبایی.

## بنەمای پازدەیەم: دابینكردنی حەوت شتە پێویستەكان بۆ سەرجەم هاووڵاتیان:

پێنج شتە پێویستەكان (الضروريات الخمس)، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن شەشن، بەڵام من شتێكی دیكەشم بۆ زیاد كردوە بۆیە دەڵێم: حەوت شتە پێویستەكان، چونكە زانایانی (أصول الفقه) بە سەرنجدانو تێوەڕامان (إستقراء)ی دەقەكانی قوڕئانو سوننەت، هەندێكیان پێنجو هەندێكیشیان شەشیان دیاریی كردون، منیش بۆم دەركەوتوە كەلەوە زیاترنو بەلای كەمەوە حەوتن، بەم شێوەیەی خوارێ:

یەكەم: دابینكردنی مافی دینداریی ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ الكافرون ﴾، ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ...﴿٢٥٦﴾ البقرة ﴾، واتە: ئیسلام كە دەسەڵاتیی هەبێ مافی دینداریی بە هەموو جۆرو شێوەكانییەوە بۆ تێكڕای خەڵك دابین دەكات.

دووەم: مافی ژیان، وەك هۆكارێكیش بۆ دابینكردنی مافی ژین بۆ هەر تاكێك خوای پەروەردگار سزاو تۆڵەی داناوە بۆ هەركەسێك دەستدرێژیی بكاتە سەر ژیانی خەڵك، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ البقرة ﴾، وە دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ

قِصَاصٌۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ المائدة﴾، بەڵێ هەموو ئەوانەی کە دەستدرێژیی دەکەنە سەر خەڵك‌و دەبنە مایەی مردنیان، یان لەدەستدانی ئەندامێکی وەك: چاو، لوت، گوێ، ددان، یان شکانی ئێسقانیان‌و بریندار بوونیان، تۆڵەیان لێ وەردەگیرێتەوە...

سێیەم: سەلامەتیی‌و پارێزراویی عەقڵ: خوای پەروەردگار بەکارهێنانی هەموو مادده سەرخۆشکەرەکانی قەدەغە کردوە بۆ ئەوەی کۆمەڵگا عەقلی سەلامەت بێ، وەك فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ المائدة﴾، هەروەها بازرگانی پێوەکردنیشی قەدەغە کردوە.

چوارەم: سەلامەتی وەچە (نسل): کە بۆ ئەم مەبەستەش سزای داوێن پیسیی دیاری کراوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ ...﴿٢﴾ النور﴾، دیارە ئەو سزایەش بۆیە دانراوە تاکو خەڵك وەچەو ڕەچەڵەکی پارێزراو بێ‌و بزانرێ کێ ڕۆڵەی کێیە؟!.

پێنجەم: پارێزرانی ئاسایش‌و ئارامیی لەنێو خەڵکدا: بۆ ئەو مەبەستەش خوای کاربەجێ سزای سەختی بۆ هەموو ئەوکەسانەی دیاری کردوە کە هێمنی‌و ئاسایشی کۆمەڵگا تێکدەدەن، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ

مِنَ ٱلْأَرْضِ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي ٱلْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٣٣) ﴾ المائدة، لێرەدا خوا چوار جۆرە سزای بۆ ئەوانە دیاری کردوە کە ئاشووب لەسەر زەویدا پەرپا دەکەنو ئاسایشو هێمنیی خەڵكو کۆمەڵگا دەشێوێنن.

شەشەم: پاراستنی ئابڕوو (عِرْض)ی خەڵك: کە سزای داوێن پیسیی دیاریکراوە بۆ هەموو ئەوانەی کەسایەتیو کەرامەتو ئابڕووی خەڵك لەکەدار دەکەن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ (٤) ﴾ النور، واتە: ئەوانەی ئافرەتانو پیاوانی داوێن پاك تۆمەتبار دەکەن بە داوێن پیسیی پاشان چوار شاهید ناهێنن، هەشتا قامچییان لێبدەن، هەروەها هەرکەسێك هەر جۆرە تۆمەتو بوهتانێکی دیکەی غەیری داوێن پیسییش بۆ کەسێك هەڵبەستێ، دیارە شەریعەتی ئیسلامیی تەعزیرو سزای تایبەتی خۆی بۆ داناوە.

حەوتەم: پاراستنی ماڵوسامانی خەڵك: وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٣٨) ﴾ المائدة، واتە: پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن، ئەوە تۆڵەو سزای خوایە تاکو خەڵکی دیکەش تەمبێ بێو پەند وەربگرێ.

بەڵێ ئەم حەوتە: (دین، ژین، وەچە، عەقڵ، ئاسایشو هێمنیی، ئابڕوو، ماڵو سامان)، دەبێ لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا واتە: شوێنێك کە

ئیسلام دەسەڵاتی تێدا هەیە، ئەم حەوتانە بۆ هەموو تاکێکی کۆمەلگا دابین بکرێن!

- مامۆستا گیان! بە خێرایی پرسیارێك، دەربارەی ئەم حەوت شتانە لەسەر زۆرینەیان سزا دراوە، وەك ئاماژەت پێکرد، بەلاّم ئایا هیچ سزایەك هەیە لەسەر ئایینداریی؟!

+ ئەگەر مەبەستت سزای هەڵگەڕانەوە (إرتداد) لە دین بێ، بێگومان ئەو مەسەلەیە پێویستی بە گفتوگۆیەکی تایبەتو بەرنامەیەکی خەڵك لەسەر هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام ئەوەندەی من بۆم دەرکەوتوە، هەڵبەتە لەنێو زانایاندا مشتومڕو کێشەی لەسەرە ئایا تۆڵەیەکی دیاریکراویی شەرعیی (حدّ)ی لەسەرە، یاخود هەر سزایەکە لەژێر ڕکێفی دەسەڵاتی شەرعیی (السلطة الشرعية) دایە؟ من ئەوەی بۆم دەرکەوتوە پێموایە ئەوەی دووەمیانە، وە لەوبارەشەوە دەکرێ بەڵگەی زۆر بێنینەوە، بۆ نموونە: دەبینین ئەو هەموو دەغەڵانە (منافقین) هەبوون لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺو کوفریشیان لێ ئاشکرا بووە، وەك خوا -عز وجل- لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ ﴿٦٦﴾ التوبة﴾، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ سَبِيلَۢا ﴿١٣٧﴾ النساء﴾، وە فەرموویەتی: ﴿وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ... ﴿٧٤﴾ التوبة﴾، کەچی نابینین پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی سزادابێ لەسەر ئەوەی لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، ئینجا یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی بۆچی

لە سەردەمی هەندێك لە چوار خەلیفە راشیدەكاندا، هەندێك كەس لەسەر ئەوە سزا دراون؟

من پێم وایە ئەو سزادانانەی هەندێك كەس لەسەر هەڵگەرانەوە لە ئیسلام لە چوارچێوەی دەستەڵاتی سیاسەتی شەرعیی‌دا بووە، هەر بۆیەش هەڵوێستی زاناو پێشەوایان لەبارەی حوكمی هەڵگەڕانەوە (إرتداد) جۆراو جۆر بووە، بۆچی؟! چونكە هی وا هەیە بەهۆی گومانێكی فیكرییەوە هەڵدەگەڕێتەوە، وە هی وا هەیە بۆ ئەوەی خەڵك چەواشە بكات هەڵدەگەڕێتەوە، وە هەیە هەڵدەگەرێتەوەو دژایەتی دەسەڵاتی ئیسلامییش دەكات، دیارە فەرمایشتەكانیش هەر ئەوە دەگەیەنن، بۆ وێنە: لە یەكێكیاندا دەفەرموێ: (لا يحلّ دم امرىء مسلم إلا بإحدى ثلاث: الثيّب الزاني، والنفس بالنفس، والتارك لدينه المفارق للجماعة) رواه البخاري ومسلم، واتە: هیچ ئینسانێكی مسوڵمان خوێنی حەڵاڵ نابێ مەگەر بە یەكێك لە سێ شتان:

1- پیاوێك ژنی هێنابێ یان ژنێك شووی كردبێ‌و زینا بكات.

2- كەسێك كەسێكی بە ئەنقەست كوشتبێ.

3- وە كەسێك لە دینەكەی هەڵگەڕابێتەوەو وازی لە كۆمەڵی مسوڵمانان هێنابێ (واتە: چووبێتە نێو كۆمەڵ‌و تاقمی بەرانبەرەوەو دژایەتی ئەهلی ئیسلام بكات).

زۆربەی شەرع زانان بڕگەی سێیەمی ئەم فەرمایشتە ئاوا تەفسیر دەكەن، هەروەها ئەو فەرمایشتەی كە دەفەرموێ: (مَن بَدَّل دينه فاقتلوه) رواه البخاري، زۆرێك دەڵێن وشەی (بَدَّل) مەبەست پێی ئەوە

نیه كه تەنیا له ڕووی فیكریی یەوه بابایەك بڵێ: من ئەوه بڕوام به ئیسلام نەما، بەڵكو مەبەست پێی كەسێكه وێڕای ئەوه دینەكەشی دەگۆڕێو دەشگوازێتەوه بۆ سەنگەرێكی دیكه، دیاره ئەو كاتەش دەبێته كافرێكی دژ به ئیسلام (محارب)، بۆیه حوكمەكەشی كوشتنه! بەڵام بەهەر حاڵ وەك پێشتر گوتمان ئەم بابەته پێویستی به توێژینەوەی زیاتر دەكات، كه لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نیه.

## بنەمای شازدەیەم: شەرعزانان بنچینەیەكیان داناوە بۆ هەڵسوكەوت كردنی مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیان لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامییدا، كە دەڵێ: (لهم ما لنا وعليهم ما علينا):

واتە: ئێمە هەر مافێكمان هەیە ئەوانیش (یانی نامسوڵمانان) هەیانەو هەر ئەركێكیشمان لەسەرە ئەوانیش لەسەریانە دیارە جگە لەوەی كە بە بەڵگەیەكی شەرعیی جیاكرابێتەوە لە مافەكان، یان لە ئەركەكان، بۆ وێنە: جەنگ‌و جیهاد لەسەر كەمایەتییە دینییەكانی ژێرسایەی دەوڵەتی ئیسلامیی فەڕز نیە، چونكە جیهاد دروشمێكی دینییەو ئەركێكی تایبەتی سەرشانی مسوڵمانانە، بۆیە كابرای جوولەكەو نەصرانیی لەسەری پێویست ناكرێ بێت لەسەر ئیسلام خۆی بە كوشت بدات، هەروەها هەرشتێكی دیكە كە دەقێكی شەرعیی لەسەر بێ، جگە لەوە لەهەموو ڕوویێكەوە وەك هاوولاتی مامەڵەیان لەگەڵدا دەكرێ‌و كراوە، كاتی خۆی كە پێغەمبەر ﷺ كۆچی كرد بۆ مەدینە (صحيفة)یەكی نووسی، كە هەندێك لە سەرچاوەكانی مێژوو پێی دەڵێن: (الوثيقة) وە لە ڕاستیدا لە جێی دەستووری ئێستا بووەو زانایان دەڵێن: یەكەم دەستووری نووسراو (دستور مدوّن) ئەو دەستوورە بوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ نووسی، بۆ چۆنیەتی مامەڵەكردنی مسوڵمانان لەگەڵ جوولەكەو هاوبەش پەیداكەران‌و سەرجەم پێكهاتەكانی شاری مەدینەدا، وە لەو دەستوورەدا ئەو ڕاستییە ڕوون‌و ئاشكرایە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك مسوڵمانان

دان بە مافی نامسوڵمانانیشدا دەنێ، هەروەها وەك ئەركێكی هاوبەشیش لەسەر هەموویان دەفەرموێ: (وأهل هذه الوثيقة يَدٌ على من دَهَم يثرب)، واتە: ئەهلی ئەم وەسیقەیە (واتە: بە مسوڵمانو جوولەكەو هاوبەش پەیداكەرو هەموو لایەكەوە) پارێزگاریی لەم شارو وڵاتە دەكەنو لە بەرانبەر هەركەسێكدا ڕادەوەستن كە دەستدرێژیی دەكاتە سەر، شایانی باسیشە ئەو وەسیقەیە (47) بەندە كە (سیرة ابن هشام)[1]و زۆر لە سەرچاوەكانی دیكەی مێژووش هێناویانە.

ئەوانە چەند بنەمایەك بوون كە شەریعەتی ئیسلامیی داینـاون بۆ ئەوەی مسوڵمانان بتوانن هەم لە چوار چێوەی قەوارەیەكی ئیسلامیداو هەم لە دەرەوەی كیانو قەوارەی ئیسلامییشدا لەگەڵ غەیری خۆیاندا تەبابنو بتوانن پێكەوە بژین، هیچ گومانیشی تێدا نیە كە ئەگەر مسوڵمانان پابەند بن بەم (16) بنەمایەوە هەم لەنێو خۆیانداو هەم لەگەڵ غەیری خۆیاندا تەباو ڕێكو گونجاو دەبنو كۆمەڵگایەكی تۆكمەو توندو تۆڵو پێكەوە جۆشدراو دەبن.

ئینجا لێرەشدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە مەسەلەیەكی گرنگ بكەم ئەویش ئەوەیە كە ئایا تەبایيو گونجاوییو هاوكاریی مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیاندا مانای ئەوەیە كە دەستبەرداری نەگۆڕەكانی خۆیان بن؟! وە واز لە دینەكەیان بێنن؟!

- مامۆستا گیان! ئەمە پرسیارێكی زۆر گرنگە، بە تایبەت ماوەیەكە لێرەو لەوێ دەبیستینو بانگەشە دەكرێ كە: مامۆستا عەلی باپیر بە

---

1) السيـرة النبوية لابن هشام، ج2، ص(262-264).

بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا هەندێ شلگیریی پێوە دیارە لە بیروبۆچوونو هەڵوێستەکانیدا، وە (کۆمەڵی ئیسلامیی) بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ واقیعی کوردستانو ناوچەکەدا هەندێك وردە دابەزین (تنازل)ی پێوە دەبینرێ لە پرانسیپو نەگۆڕەکان (ثوابت)ی خۆی! بەڕێزتان وەڵامتان بۆ ئەم پڕوپاگەندانە چییە؟

+ لەڕاستیدا ئەو قسانە هی کەسانێکن شارەزای ئێمە نەبنو لە نزیکمانەوە نەژیابن، یان شتی ئێمەیان نەخوێندبێتەوە! ئەگەر نا ئەو شتانەی ئێستا من دەیانڵێم هەموو ئەو شتانە کەمو زۆر لە کتێبەکانی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)و (تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان)و کتێبەکانی پێشترمدا بە ڕوونو ڕاشکاویی هەن، بەڵام ڕەنگە ئێستا لەم هەلومەرجەدا پێویست بکات ئێستا زیاتر تیشکیان بخەینە سەرو ڕوونیان بکەینەوە!

ئینجا بە ڕاستی سووڕەتی (الكافرون) کە پێشتر باسمان کرد، زۆر باش وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوەو هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سووڕەتەش[1] ئەوەبوو کە ڕۆژێك بێبڕوایەکان وەفدێکی دانوستانیان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺو گوتیان: ئەی موحەممەد! وەرە با شتێك بکەین، تۆ ساڵێك پەرستراوەکانی ئێمە بپەرستەو ئێمەش ساڵێك خوای تۆ دەپەرستین، هەردووکمان لە بتەکانو لە خواشدا بەشداربین، (واتە: پێکەوە تەباو گونجاو بین)، جا خوای کاربەجێ لەم سووڕەتەداو لە وەڵامی ئەو قسەیەدا هەم پارێزگاریی لێکردنی نەگۆڕەکانو هەم

1) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص1537.

تەبایی‌و گونجاویی لەگەڵ ئەوانی دیکەشدای خستۆتە ڕوو، دەفەرموێ: ئەی موحەممەد ﷺ بە بێبڕواکان بڵێ: نە من پەرستراوەکانی ئێوەم پەرستوەو دەپەرستم‌و نە ئێوەش خوای من دەپەرستن‌و پەرستووتانە، سەبارەت بە پێکەوە ژیان‌و تەبایی‌و پێکەوە گونجانیش دەفەرموێ: (لكم دينكم ولي دين) دینی خۆتان بۆ خۆتان‌و منیش دینی خۆم بۆ خۆم، یانی تۆ پارێزگاریی لە دینی ناڕاستی خۆت بکەو لەسەری بە، بەڵێ من وەك بانگەوازو تێگەیاندن بانگت دەکەم بۆ دینی حەقی خوا، بەلام تۆبزیی‌و زۆرت لێ ناکەم چونکە دینەکەم ڕێم نادات، جا من کە دینەکەم ڕێم نەدات تۆبزیی لە تۆ بکەم بۆ هاتنە سەر دینی هەق، تۆ چۆن زۆرم لێدەکەی بێمە سەر ئەو دینە ناحەقەی تۆ؟! کەواتە: (لكم دينكم ولي دين) دینی خۆتان بۆ خۆتان‌و دینی خۆشم بۆ خۆم‌و هەرکەسەمان لە ماڵی خۆی!

ئینجا ئەوانەش کە پێیان وایە ئێمە شلگیریی دەکەین، دیارە بە پێچەوانەوە خەڵکی دیکەش هەیە دەڵێن: فلان کەس هەر وەك پێشێیە، وەمن پێم وایە هەردوو لایان ڕاست دەکەن! ئەوانەی دەڵێن: هەروەك پێشێیە، ڕاستە هەتا دەمرین هەر لەسەر نەگۆڕەکان (ثوابت)ی شەرعیی خۆمانین، ئەوانەش کە دەڵێن: شلگیریی دەکەن، لە ڕوویەکەوە ڕاست دەکەن، چونکە بێگومان ئێمە لە بواری هەڵسوکەوت‌و مامەڵەدا، دینەکەمان وامان فەرمان پێدەکات، ئاخر کێ لە پێغەمبەرمان ﷺ نەرمترو میهرەبانترو بەڕەحمتر بووە لەگەڵ خەڵکدا، تەنانەت لەگەڵ دوژمنەکانی خۆی‌و پەیامەکەشیدا؟! بۆیە ئێمە چ ئەگەر نەرمکێشیی بکەین لە سنووری شەرعدا، وە چ سەختگیریی

بکەین لە پارێزگاریی کردن لە نەگۆڕەکانی شەرعو ئەو شتانەدا کە نابێ دەستکاریان بکرێ، ئەوە بێگومان لەهەردوو حاڵاندا هەر چاو لە پێغەمبەری خۆمان ﷺ دەکەین!!

- زۆر سوپاس مامۆستا گیان، بێگومان ئەو بنەمایانەی بەڕێزتان خستتاننە ڕوو، بۆ تەبایيو پێکەوە ژیانی مسوڵمانان لەگەڵ غەیری خۆیاندا، زۆر باسێکی گرنگو بەپێز بوون، بەلاَم لێرەدا کاتی بەرنامەکەمان بەرەو کۆتایی دەچێ، بەس من دەمەوێ بە کورتی هەندێك شت لە بەڕێزتان بپرسم، دیارە لە مێژووی ومارەسەکردنی حوکمڕانیی مسوڵمانانیدا وەك قەوارەو دەوڵەت، لەو چوارچێوەیەدا، هەندێك حاڵەت هەیە پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو بنەمایانەی باستان کرد، بۆ وێنە: ئەوانەی لەسەر غەیری ڕێبازو بەرنامەی ئیسلام بوون پێیان گوتراوە: خاوەن پەیمان (أهل الذّمة)، ئایا ئەوە بەکەم سەیرکردن لەقەڵەم نادرێ؟ یاخود سەرانە (جزیة)یان لێوەرگیراوە، یاخود هەندێك ئەرك (وظیفة)ی دەوڵەتو حوکمڕانییانیان پێ نەسپێردراوە، ئایا مەجال هەیە کە پێیان بسپێردرێ؟ بۆ وێنە: ئەگەر کیانو دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبێ دەکرێ پارێزگار (محافظ) لە غەیری مسوڵمانان بێ؟ یان بۆ نموونە دەڵێن: جوولەکەو نەصرانییو شوێنکەوتووانی ئایینەکانی دیکە بەرگو پۆشاکێکی تایبەتییان پێ لەبەر کراوە!

+ ئێمە لە کتێبی (تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان)دا لە باسی (تەبایيو پێکەوە ژیان)دا، وەلاَمی ئەو پرسیارانەمان داوەتەوە، بەلاَم ئێستا هەر بە کورتی دەڵێم: وشەی (أهل

الذِّمة) ئەگەر خەڵك لە ئەسڵی واتاكەی تێبگات، وشەیەكی زۆر یاساییو ئاساییە، چونكە وشەی (ذمّة) واتە: ئۆباڵ، پەیمان، كەواتە: ئەهلی زیمە (أهل الذمة) واتە: خاوەن پەیمان، ئەوەش یانی: پاراستنیماڵو سامانو سەرو گیانو ڕێزو كەرامەتی خەڵكێك كە نامسوڵمانن‌و لە چوارچێوەو ژێر سایەو سێبەری دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین، پاراستنی ئەوانە ئۆباڵو پەیمان (عهد)ێكە لە گەردنی مسوڵمانان دایە.

- دەكرێ ئەم وشەی (أهل الذمة) بەكاریش نەهێنرێ؟

+ بەڵێ دەكرێ بەكاریش نەهێنرێ، چونكە شتێك نیە شەریعەت پێداگیریی لەسەر بكات، كە حەتمەن دەبێ غەیری ئەوە بەكار نەهێنرێ!

(عمر بن خطاب) خوا لێی ڕازی بێ نەك هەر ئەم وشەیە، بەڵكو وشەیەكی دیكەی بەكار نەهێنا، كاتێك بەرژەوەندی ئیسلامو مسوڵمانان خواستی، هەرچەندە وشەكە لە قوڕئانیشدا هاتوە، كە بریتیە لە وشەی (الجزية)، وك خوای پەروەردگار لە قوڕئان دەفەرموێ: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾التوبة، واتە: جەنگ بكەن لەگەڵ ئەوانەی بڕوا ناهێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وە ئەوەی خواو پێغەمبەرەكەی حەرامیان كردوە بە حەرامی دانانێن، وە مل كەچ ناكەن بۆ ئایینی ڕاستی خوا، لەوانەی كتێبیان پێ دراوە، هەتا سەرانە (جزية) دەدەن بە مل كەچیی.

جا تیرەیەكی نەصرانی هەبوون لە عەرەبەكان لە سەردەمی عومەردا خوا لێی ڕازی بێ بەناوی (بنو تغلب) هەواڵیان بۆ ناردو گوتیان: ئێمە زۆرمان پێناخۆشەو بە زەبوونیی خۆمانی دەزانین كە بەناوی سەرانە (جزیة)وە لێمان وەربگیرێ، بۆیە داواكارین بۆمان دووقات بكەنەوە بەڵام بە ناوی زەكات (صدقة)ەوە لێمان وەربگرن! عومەر خوای لێی ڕازی بێ ڕازی بوو و گوتی: (هؤلاء قومٌ حُمْقى رَضَوْا المعنى وأَبوا الأسم)(1)، واتە: ئەوانە كەسانێكی نەفامن بە ماناكەی ڕازین، بەڵام ناوەكەی قبووڵ ناكەن، باشە قەیناكات بە ناوی صەدەقەوە لێیان وەرگرن، كەواتە بەرانبەر وشەی (أهل الذمة) دەتوانین بڵێین: (هاووڵاتی) چونكە بێگومان لەگەڵمان لە وڵاتێكدا دەژین!

وە دەربارەی سەرانە (جزیة)، زانایانی سیاسەتی شەرعیی پێیان وایە ئەوە باجێكی دارایی‌یە وەك چۆن مسوڵمانان زەكات دەدەن، غەیری مسوڵمانانیش كە لەژێر سایەو سێبەری دەوڵەتی ئیسلامیی‌دا بە ئازادیی دەژین، ئەو ئەندازە ماڵە دەدەن، دیارە ئەویش لەسەر بابای پیر، نەخۆش، ئافرەت، منداڵ، ڕاهیب‌و گۆشەنشینەكان نیەو لێیان وەرناگیرێ، تەنیا لەسەر كەسانێك كە هەبوو بن‌و كاسبكارو بەتوانا بن، ئینجا ئەو بڕە ماڵەش شتێكی كەمەو كەمترە لەو زەكاتەی لەسەر مسوڵمانان فەرزە، وەهەندێك لە زانایانی ئیسلامیش دەڵێن: ئەو سەرانەیە بەرانبەر زەكاتی مسوڵمانان نیە، بەڵكو لە بەرانبەری

---

1) (خطابنا الاسلامي في عصر العولمة)، الدكتور يوسف القرضاوي، ص5، وە بڕوانە: (كتاب الخراج) لأبي يوسف.

خزمەتی سەربازیی‌یە (الخدمة العسكرية)، چونكە ئەوان جەنگیان لەسەر فەرز نەكراوەو جەنگ‌و جیهاد دروشمێكی ئیسلامییەو نامسوڵمانیش لەسەری پێویست ناكرێ كە بەرگریی لە دەوڵەتێكی ئیسلامیی بكات، لە بەرانبەر ئەوەدا دێنێ ئەندازەیەك ماڵ دەدات، بۆیەش هەندێك لە شەرعزانانی هاوچەرخ دەڵێن: ئەگەر هات‌و ئەوانەی پێیان دەگوترێ: خاوەن كتێب (أهل الكتاب) یان خاوەن پەیمان (أهل الذمة) ئامادەبوون سەربازیی بكەن، ئەو سەرانە (جزية)یان لەسەر لادەچێ، هەڵبەتە من پێشم وایە تەنیا جولەكەو نەصرانیی ئەو جۆرە مامەڵەیان لەگەڵدا ناكرێ، وەك لە كتێبەكانی (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)و (تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەكانیان)دا باسم كردوە، بەڵكو هەموو كەمایەتی‌یە دینیەكان‌و هەر نامسوڵمانێك دەگرێتەوە، لەو شوێنانەشدا كە ئاماژەم پێدا، بەڵگەم لەسەر ئەم بۆچوونەم هێناوەتەوە!

دەربارەی كارپێسپاردنیشیان، شەرعزانان (فقهاء) دەڵێن: هیچ قەدەغە بوون (حَظْر)ێك لەسەر ئەهلی كیتاب‌و نامسوڵمانان نیە كە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا خزمەت بكەن، جگە لەوەی كە بە دەقێكی شەرعیی لێیان قەدەغە كرابێ، ئەوی دیكە هەمووی ئەسڵ تێیدا دەست كراوەیی‌و ڕێ پێدران (إباحة)یە، دیارە بە دەقی شەرعیش ئاشكرایە كە دەستەڵاتداری یەكەم‌و حوكمڕانی مسوڵمانان دەبێ هەر مسوڵمان بێ، چونكە بابای حوكمڕان دەبێ شەریعەت پیادە بكات‌و كەسێكیش مسوڵمان نەبێ، چۆن شەریعەت پیادە دەكات؟! هەروەها دەبێ هەركام لە سەركردەی سوپا، قازی، ئیمام‌و پێشنوێژو ئەوانە

مسوڵمان بن، وەك چۆن دەبێ سەرۆكی ئاینیی‌و پێشنوێژو بەرێوەبەری پەرستگاكانی ئەوانیش، هەر لە خۆیان بن‌و ئیسلام ناچێ پاپاو كاردینالْ‌و ئەسقەف‌و... هتد بۆ ئەوان دابنێ.

بەڵام كارە ئیدارییەكانی دیكە ئەوە دەكەوێتە سەر ئیجتیهادی حوكمڕانان‌و لە ئەسڵیشدا مافی خۆیانە بەشدار بن لە ئەنجوومەنی راوێژدا، وە دەتوانن ببنە وەزیر لەو بوارەدا كە تێیدا شارەزاو پسپۆڕن، وە لە مێژووی حوكمڕانانی مسوڵمانانیشدا ئەزموونمان هەیە لە سەردەمی ئەمەوییی‌و عەبباسیەكاندا ئەهلی كیتاب كاروباری ئیدارییان پێ سپێردراوەو هەیان بووە پلەی وەزیریشی هەبووە.

- زۆر سوپاس مامۆستای بەڕێز بە ڕاستی كۆمەڵێك بنەمای گرنگت خستە ڕوو كە ئەگەر ئەو بنەمایانە لەنێو مسوڵماناندا جێبەجێ بكرێن، تەبایی‌و پێكەوە ژیانی ڕاستەقینە جێگیر دەبێ‌و گرفتێك نایەتە پێش.

+ ڕاستە بەڵام بێگومان مسوڵمانان بەر لە نامسوڵمانان پێویستییان بە تەبایی هەیە، كە دیارە هی خۆیان لە تەبایی بەرزو بەهێزترە كە بریتیە لە برایەتیی، من زۆر جار گوتوومە: (دەبێ بەرانبەرەكەت یان لەدیندا لەگەڵت برابێ، یان لە ژین لەگەڵت تەبابێ!).

جا ئەوەی ئەهلی ئیمان‌و ئیسلام بەر لە تەبایی برایەتییان هەیە، كە برایەتیی دەبێتە ماك‌و بناغەی تەبایی‌و یەكتر خۆشویستن‌و هاوكاریی، بەڵام ئەوەی برای دینیت نەبێ دەبێ لە ژیندا لەگەڵی تەبا بی‌و لەگەڵت تەبا بێ، بۆ ئەوەی پێكەوە ژیانێكی بەختەوەرانە بگوزەرێنری‌و ئەو

حیکمەتو ئامانجە کە خوای کاربەجێ ئاسمانو زەمینو ژیانو مەرگی بۆ هێنانەدی کە تاقیکرانەوە (إبتلاء)یە، بێتەدی، وەك فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ...﴿٧﴾ هود﴾، واتە: وە ئەو (خوا) کەسێکە کە ئاسمانەکانو زەوی لە شەش ڕۆژاندا (بە شەش قۆناغ) دروستکردن لە حاڵەتێکدا کە بارەگایەکەی لەسەر ئاو بوو تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی چاکترە! هەروەها فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ...﴿٢﴾ الملك﴾، واتە: (خوا) کەسێکە کە مەرگو ژیانی ڕەخساندوون تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە.

کەواتە: ئاسمانەکانو زەویو هەرچی تێیاندایەو مەرگو ژیانیش ئامانجو حیکمەتی وەدیهێنرانیان بریتیە لە تاقیکرانەوەی مرۆڤو جند، بۆیە بەپێی ئایینو بەرنامەی خوا پێویستە هەلو مەرجو دەرفەتی ژیانێکی مرۆڤانەی ئاشتییانەو تەبایانە بۆ سەرجەم تاکەکانی مرۆڤ و جند بڕەخسێنرێ تاکو بتوانن ئازادانە تاقیکردنەوەی خۆیان بدەن!

# ڕێ خۆشکردن

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين وآله المهتدين بهديه المبين، من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بأحسانٍ الى يوم الدين.

بەڕێزان !

ئەم باسەی بەر دەستتان لە ئەسڵدا بابەتێکە کە لە یەکێك لە ئەڵقاکانی بەرنامەی (سەرنج)ی کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)داو لە میانەی پرسیارو وەڵامی پێشکەشکاری بەرنامەکە کاك عومەر گوڵپی‌و بەندەدا، پێشکەش کراوەو پاش هێنرانە[1] سەر کاغەزو چاوپێداگێرانەوەی‌و سووکە دەستکارییەکی خۆم، وە زیادکردنی: (کورتە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی چەند دەربارەی فەرموودەیەك کە لەسەر ناڕەوایی هاوپەیمانێتی بەبەڵگە دەهێنرێتەوە)، بەجۆرەی لێهاتوە، کە وەك بەشێکی ئەم کتێبەی بەردەستتان لە دوو (بەند)دا خراوەتە ڕوو.

شایانی باسیشە کە بەقەناعەتی من ئەم باسە هەرچەندە کورتیشە، بەڵام بایی قەناعەت پێهێنانی هەرکەسێك دەکات کە دڵسۆزانە بەدوای هەقدا بگەڕێ‌و بەڵگەو بەرچاو ڕوونیی باشی گرتوونە خۆی لەسەر ڕەوا (مباح) بوونی هاوپەیمانێتی بەستن لە نێوان لایەنێکی ئیسلامیی (یان

1) لەلایەن کاك (موحەممەد جەمال ئەحمەد)ەوە خوا پاداشتی بداتەوە.

زیاتر) لەگەڵ لایەنێك یان زیاتری نائیسلامییدا، خاوەنی هەر جۆرە بیرو ڕایەك بێت، جا ئەو لایەنە ئیسلامییە چ لە قۆناغی بانگەواز (الدعوة)دا بێتو لەچاو بەرانبەرەكانی كەمهێز بێ ، وە چ لە قۆناغی دەوڵەت دابێ‌و لەچاو بەرانبەرەكانی بەهێزتر بێت.

چونكە وەك لە دووتوێی ئەم وتوێژەدا ڕوونكراوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەم لە مەككە كە لە قۆناغی بانگەوازو حاڵەتی چەوسێنرانەوە (اضطهاد )دا بوو، وە هەم لە مەدینەش كە لە قۆناغی دەوڵەتو حاڵەتی هێزو دەسەڵات دابووە، بەگوێرەی بە پێویست زانینو داخوازیی هەلومەرج، چەندان جۆرە هاوپەیمانێتیو ڕێككەوتننامەی لەگەڵ چەندان لایەنی نامسوڵماندا ئیمزا كردوە، یان هێناوەتە سەر ئیمزاكردن، وەك: سێ تیرە جوولەكەكانی دەوری مەدینە: (بنو قینقاع، بنو النضیر، بنوقریظة)، وە هۆزی (قریش)، وە تیرەی (خُزاعَة)، وە تیرەی (بنو ضْمرَة)، وە هۆزی (غَطَفان)و... هتد، ئینجا وێڕای ئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ پەسندیی خۆی بەرانبەر بە دوو پەیمان (حِلْف)ی دیكە دەربڕیوە، كە سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتی تێیاندا بەشدار بووەو ڕایگەیاندوە كە لە ئیسلامیشدا ئامادەی بەستنی پەیمانی لەو جۆرەیە، كە بریتین لە: پەیمانی جوامێران (حلف الفُضول)و، پەیمانی بۆنخۆشكەران (حلف المُطَیِّبین)، ئاشكراشە كە هەركام لە دوو پەیمانو ڕێككەوتن (إتفاقیة)ش لە ڕۆژگاری نەفامێتی (عصر الجاهلیة)داو لە نێوان چەند هۆزو تیرەیەكی هاوبەش بۆ خوا دانەرو بتپەرستدا بوون.

بەپێویستیشی دەزانم كە لەكۆتایی ئەم ڕێ خۆشكردنەدا ئاماژە بۆ مەسەلەیەكی گرنگ بكەم:

بابەتی هاوپەیمانێتی بەستن –کەوەك لەم باسەدا ڕوونمان کردۆتەوە، لە بنەڕەتدا شتێکی ڕەوا ڕێ پێدراوە- بابەتێکی یەکجار گرنگ و هەستیارەو دەگونجێ دەرهاویشتەو دەرەنجامی جۆراوجۆری لێ بکەونەوە، بە هەردووك باری چاك و خراپداو بەگوێرەی تێدا پێکان و نەپێکان، بۆیە پێویستە سەرکردەو مشوورخۆران زۆر بەوریایی و هۆشیارییەوە هەنگاوی تێدا هەڵێنن و، هەتا دەتوانن ڕاوێژی تێدا بکەن و ئەوپەڕی وردبینیی و دووربینیی تێدا بەکاربێنن، ئەوە لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەو بابەتە ئاستێکی بەرزی هۆشیاریی سیاسی و ئاسۆیەکی فراوانی فیکریی پێویستە، ئەگەر بێت و سەرکردەو مشوورخۆرەکان زەمینە سازییەکی باشی فیکریی و پەروەردەیی لەنێو ئەندام و دۆست و لایەنگراندا بۆ نەکەن، ڕەنگە ڕووبەڕووی گلەیی و گازندەو ڕەخنەی زۆر ببنەوەو بگرە سەریش بکێشێ بۆ لێك ترازان و پەرتەوازەییش!

دیارە هەرکام لە ڕێککەوتن (صلح)ی حودەیبییەی[1] سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ڕێککەوتنی دوای شەڕی (صفِّین)ی[2] ڕۆژگاری عەلی کوڕی ئەبوو طالیب خوا لێی ڕازی بێ، کە شۆڕەتی (تحکیم)ی وەرگرتوە، چاکترین بەڵگەو نموونەن لەوبارەوە!

چونکە لەئاکامی هەرکام لەو دوو ڕێککەوتن و پێکهاتنەدا، لە هی یەکەمیاندا زۆربەی خەڵکەکەو لەهی دووەمیاندا ژمارەیەك ناڕازیی بوون و

---

1) بڕوانە: (السيرة النبوية لابن هشام)، ج3، ص(176–162).
2) بڕوانە: (سيرة أمير المؤمنين: علي بن أبي طالب)، ص(487–460)، الدكتور علي محمد الصلابي.

ڕەخنەیان گرتو، ئەو پێکهاتنو پەیمانبەستنەیان لەگەڵ لایەنی بەرانبەردا پێ قبووڵ نەکرا، بەڵام لەسوڵحی حودەیبییەدا بە حیکمەتو لێزانیی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەكو، گوێڕایەڵیی و متمانەی خەڵکەکە بەرانبەر بە قیادە، لەلایەکی دیکەوە، کێشەو گرفتی بەرەی ڕەخنەگرو نارازیی (جبهة المعارضة) بەبێ سەرئێشەو دەرهاوێشتەیەکی خراپ، چارەسەر بوو، بەڵام لە صولْحی تەحکیمدا ئەو کێشەو گرفتە چارەسەر نەکراو سەرەنجامیش دەرهاوێشتەی یەکجار خراپی لێکەوتنەوە، کە خراپترینیان لێك ترازانی ڕیزەکانی سوپای خەلیفەی چوارەمی پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبوو طالیبو، پاشان شەهیدکرانی خۆیشی بوو بەدەستی یەکێك لەو ڕەخنەگرو نارازییە کەللە ئێشكو ناحاڵییانە کە (عبدالرحمن بن ملجم) بوو!

خوای بەبەزەیی و بەخشەر بەلوتفو کەرەمی بێ سنووری خۆی هیدایەتی زیاتری هەموو لایەکمان بدات، بەجۆرێك کە هەرچییەك خێرو بەرژەوەندیی خەڵكو کۆمەڵگامانی تێدایە، لەهەر قۆناغو هەلو مەرجێکدا بتوانین لێزانانەو بوێرانەو وردبینانەو دووربینانە، بڕیاری لەسەر بدەینو هەنگاوی بۆ بنێینو، هێندەش ڕاوێژ پێکردنی خەڵکەکەمانو بەرچاو ڕوونکرنەوەو ئیقناع کردنیان ڕەچاو بکەین، کە ڕێ نەدەین هیچکەسمان لێ بڕەنجێ، یان بەجێ بمێنێ.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألاّ إله إلاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك

2 جمادي الثانية 1430

27 مایسی 2009

هەولێر

**بەندی یەکەم:**

## کورتــــە لێکۆڵــــینەوەیەك دەربـــــارەی چـەند فەرموودەیـەك کـە لەسـەر نـاڕەوایی هاوپەیمانێتی (تحالف) بەبەڵگە دەهێنرێتەوە

خوێنەری سەنگین!

خوا پشتیوان بێ لەم بەندی یەكەمەی ئەم بەشی دووەمەدا بەكورتیو پوختی لەچەند فەرمایشتێكی بەپێزی پێغەمبەری بەرزو بەڕێزمان محمد ﷺ دوكۆڵینەوە، كە هەندێك كەس بەهەڵە لەسەر ڕەوا (مباح) نەبوونی هاوپەیمانێتی بەستن (التحالف) بە بەڵگەیان دێننەوە، چونكە بۆ باباى سەركێڵ ڕواڵەتەكەیان ئەوەی لێ دەفامرێتەوەو دیارە سەركێڵیو ڕواڵەتبینینش گەلێك جار مایەی بەهەڵەداچوونە لە لێتێگەیشتنی ئایەتەكانی خوا عز وجل و فەرموودەكانی پێغەمبەرەكەی ﷺ هەربۆیەش خوای كاربەجێ مەدحی قوڵبووەوان (الراسخون) لە تێگەشتنی قورئانی كردووەو فەرموویەتی: ﴿...وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ ...﴿٧﴾ آل عمران﴾، واتە: وە قووڵبووەوان دەڵێن: بڕوامان پێی هێناوە هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە....

بەڵام بەرلەوەی دەست بەتوێژینەوە لەبارەی هەندێك لەو فەرمایشتانەوە بكەم بەپێویستی دەزانم سەرەتا پێناسەیەكی كورتی هاوپەیمانێتی (تحالف) بكەم، چ لە ڕوانگەی زمانەوانییو، چ لە ڕوانگە زاراوەیی (إطلاح)یەوە:

1- لەڕووی زمانەوە:

وشەی (حلف) كە لەزمانی كوردیدا بە پەیمانو بەڵێن مانا كراوە، فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبی بە:

أ- سوێند (حلف) كە چاوگەكەی (حلف و محلوف)ە.

ب- وەبە: پەیـمان (عهد).

ج- وە بە: برایەتیی‌و هاوەڵایەتیی (الأخوة والصداقة) هاتوە.

دیارە مانا بنەڕەتییەكەیشی سوێند خواردنەو بۆیەش برایەتیی‌و بەڵێن بەیەكدی دان‌و پەیـمان پێكەوە بەستنیش ئەو وشەیەی بۆ بـەكارهێنراوە، چونكە زۆرجار بەمەبەستی داكـۆكی لەسـەركردنیان سـوێندیان لەسـەر خواردوە[1].

## 2- لە زاراوەی زانایاندا:

مانای زاراوەیی‌و شەرعیی وشەی (حلف)یش زۆر لەمانا زمانییەكـەی نزیكەو جیاوازییـەكی وایـان نیـە، چـونكە زانایـان بـەمجۆرەیان پێناسـە كردوە[2]: (المُعاقدة والمعاهدة على التعاضُدِ والتساعُدِ والأنفاق...)، واتە: گرێبەست كردن‌و پەیماندان لەسەر پشتی یەكدی گرتن‌و هاوكاری یەكدی كردن‌و پێكەوە ڕێككەوتن.

شایانی باسیشە كە وشەی (حلف) بە (أحـلاف) كۆدەبێتـەوەو وشـەی (تحالف)یش لەسەر كێشی (تفاعـل) بـەمانای هاوپەیـمانێتی‌و بـەڵێن پێكدان‌و پێكەوە ڕێككەوتنی دوو لایەن یان زیاترە.

كەواتە: وشەی هاوپەیمانێتی (تحاف) كە لە وشەی (حلـف)ەوە هـاتوە،

---

1) (القاموس المحيط)، ج3، ص133، باب الفاء، فصل الحاء، وة لسان العرب، ج9، ص54.
2) النهاية في غريب الحديث والأثر، لابن الأثيـر، ج1، ص(426-425).

هەم لە ئەسڵی زمانو هەم لەزاراوەی زاناو شارەزایاندا بەمانای بەڵێنو پەیمان بەیەكدی دانی دوولایەن یان زیاتر لەسەر هاوكارییو دەستبار بۆ یەكدی گرتنو بەرگریی لەیەكدی كردن، دێ، جا ئەو هاوپەیمانێتیە چ بۆ مەبەستێكی ڕەوا بێ شەریعەت بەڕەوا درووستو بەپێچەوانەشەوە بە نارەواو نادروستی دەزانێ وەك هەر شێوازو ئامرازێكی بێلایەنو لەئەسڵدا ڕەوای دیكە.

كەوابێ:

ئەوەی كە حوكمی هاوپەیمانێتی (تحالف) دیاری دەكات بریتیە لەو ئامانجو مەبەستەی كە لایەنە هاوپەیمانو بەڵێن پێكدەرەكان پەیمانو بەڵێنەكەیان لەپێناودا بەستوە، وەك دواتر بەدرێژیی قسەی لەسەر دەكەین.

ئێستاش بابچینە سەر توێژینەوەو سەرنج لێدانو تێوەڕامانی چەند فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوا ﷺ كە وەك گوتمان ڕواڵەتەكەیان ئەوە دەگەیەنێ كە هاوپەیمانێتی بەڕەهاییو بەگشتیو بەبێ هەڵاواردن (إستثناء) قەدەغەو ڕێ پێنەدراوە:

ئەمەش دوو نموونە لەو فەرموودانە:

1- (( **لا حِلْفَ في الإسلام، وأَيُّما حِلفٍ كان في الجاهلية لم يَزِدْهُ الإسلام إلاّ شِدَّةً** )) رواه مسلم برقم 2530، واتە: پەیمان پێكەوە بەستن لە ئیسلامدا نیە، وە هەر پەیمانێك لە سەردەمی نەفامێتیدا بووبێ، ئیسلام هەر زیاتر پتەوی كردوە.

2- ((**أَوفُوا بِحِلف الجاهلية فأنَّه لا يزيدُهُ- يعني الإسلام- الّاشِدَّةً، ولا تَحْدِثوا حِلْفاً في الاسلام**)) رواه الترمذي وحَسَّنَهُ الألباني، برقم: 1585، واتە: پەیمانی سەردەمی نەفامێتی بەرنەسەر، چونكە ئیسلام هەر پتەوتری دەكات، بەلاَم لە ئیسلامەتیدا هیچ پەیمانێك مەبەستن.

وەك دەبینین ڕواڵەتی ئەم دوو فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ كە هەر جۆرە پەیمان بەستنێكو هەموو جۆرە هاوپەیمانێتی (تحالف)ێك لە ئیسلامدا قەدەغە بێ! بەلاَم بێگومان ئەو جۆرە تێگەیشتنە ڕواڵەتییە لەم دوو فەرموودەیەو هاووێنەكانیان، هەڵەیە، چونكە چەندان ئایەتی خوا -سبحانه وتعالى- و فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، زۆر بە ڕوونو ڕاوشكاوی باسی ڕەوایی پەیمان پێكەوە بەستن (تعاقد)و هاوپەیمانێتی (تحالف)یان كردوەو فەرمانیشیان كردوە بە وەفاداریی بە بەڵێنو پەیمانو جێبەجێكردنیو، هەڕەشەشیان كردوە لە كەسێك یان لایەنێك كە پەیمان دەشكێنێو نایگەیەنێتە سەر!

دیارە وێڕای ئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ -وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا- چەندان جۆرە هاوپەیمانێتی لەگەڵ چەندان جۆرە لایەندا بەستوەو هەتا سەریش پێیانەوە پابەند بووە، مەگەر بەرانبەرەكانی شكاندبیانو غەدریان كردبێ.

ئەمەش چەند ئایەتو فەرموودەیەك لەبارەی ڕەوایی پەیمان بەستنو گرنگییو پێویستیی پێوە پابەند بوونی:

1- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ...﴾ المائدة ١، واتە: ئەی

ئەوانەی بڕواتان هێناوە! پەیمانەکان جێبەجێ بکەن.

دیارە وشەی (عقود) کۆی (عَقْد)ەو ئەمیش بەمانای (عَهْد)ەو هەردووکیشیان لەزمانی کوردیدا بە مانای (پەیمان) یان (بەڵێن) دێن، (ابن کثیر) لە تەفسیری (أوفوا بالعقود)دا دەڵێ[1]:( قال ابن عباس ومجاهد وغير واحد: يعني بالعقود العهود، وحكى ابن جرير الاجماع على ذلك، قال: والعهود ما كانوا يتعاهدون عليه من الحلف وغيره)، واتە: ( ابن عباس)و (مجاهد)و غەیری وانیش گوتوویانە: مەبەست لە (عقود)، (عهود)ە، وە (ابن جرير الطبري) یەکدەنگیی زانایانی لەو بارەوە گێڕاوەتەوە، (عهود)یش بریتین لەو پەیمانانەی کە لەنێو خۆیاندا دەیانبەستن لە هاوپەیمانێتیو غەیری ئەوەش.

2- ﴿ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلْأَيْمَٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا ... ﴿٩١﴾ النحل﴾، واتە: ئەو سوێندانەی کە بۆ تەئکید کردنەوەی پەیمان خواردووتانن، هەڵیان مەوەشێننەوە.

3- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ الرعد ﴾، واتە: وە ئەوانەی کە پەیمانی خوا پاش پتەوکردنی هەڵدەوەشێننەوە، وە ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە بگەیەنرێ دەیپچڕێنن، وە خراپەکاریی لە زەویدا دەکەن، ئەوانە نەفرینی خوایان لێیەو خراپترین مەنزڵگایان هەیە.

1) بڕوانە (مصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص 349.

4- هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە: لە یەکێك لە فەرموودەکانی دا بێ بەڵێنیی و پەیمان شکێنیی، بە یەکێك لە نیشانەو خەسڵەتەکانی بابای مونافیق دادەنێ، وەك فەرموویەتی: ((**آية المنافق ثلاثٌ: إذا حدَّث كَذَب، وإذا وَعَدَ أخْلَفَ، واذا أُتمِنَ خاف، وفي رواية: وإذا عاهَدَ غَدَرَ، وإذا خاصم فجر**))

رواه البخاري، واتە: نیشانەکانی مونافیق سێن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، وە ئەگەر بەڵێنیدا دەیشکێنێ، وە ئەگەر سپاردەی پێ سپێردرا، ناپاکیی تێدا دەکات.

وە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: (وە ئەگەر پەیمانی بەست دەیشکێنێ، وە ئەگەر ناکۆکی هەبوو لەگەڵ کەسێکدا تاوان دەکات).

کەواتە:

مادام ئەو هەموو ئایەتو فەرموودانە لەسەر گرنگیی پەیماندانو هاوپەیمانێتیی و خراپیی و دزێویی پەیمانشکێنیی و بێ بەڵێنی هەن، وە پێغەمبەری خواش ﷺ بە کردەوە ئەو هەموو جۆرە هاوپەیمانێتیی و ڕێککەوتنانەی (التحالفات و الأتفاقيات)ی لەگەڵ چەندان جۆرە لایەندا کردوون، بەهیچ ڕەنگێك ناگونجێ ئەو ماناو چەمکە ڕواڵەتییەی لەو دوو فەرموودەیە -کە پێشتر هێنامانن- وەردەگیرێ، مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووبێ، چونکە ناگونجێ پێغەمبەری خوا پێچەوانەی قورئانو پێچەوانەی کردەوەی خۆیشی قسە بکات!

کەواتە:

باسەرنجی قسەو هەڵوێستی زانایانی ئیسلام بدەین داخۆ لەبارەی ئەو دوو

فەرموودەیەو هاووێنەکانیانەوە چییان گوتوەو ئەو ناکۆکیی (تناقض)یە ڕواڵەتییەی ئاماژەمان پێکرد -کە لەنێوان ئەو فەرموودانەو ئایەتەکانی خواو هەڵوێستی کردەیی پێغەمبەردا هەیە- چۆنیان چارەسەر کردوە؟

سەرەتا باقسەو هەڵوێستی یەکێك لە هاوەڵان کە (أنس بن مالك)ە خوا لێی ڕازی بێ، لەوبارەوە بخەینە ڕوو:

**((عن عاصم الأحول قال: قلت لأنس بن مالك: أَبَلَغَك أَنَّ النبيَّ ﷺ قال: ((لاحِلْفَ في الأسلام))؟ فقال: قد حالَفَ النبيُّ ﷺ بين قريشٍ والأنصار في داري))** رواه البخاري، برقم: 2172، واتە: (عاصم الأحول) دەڵێ: بەئەنەسی کوڕی مالیکم گوت: پێت گەیشتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نیە))؟! گوتی: پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەی مندا پەیمانی لەنێوان قوڕەیش‌و پشتیواناندا بەست! ئاشکراشە مەبەستی ئەنەس خوالێی ڕازی بێ، لەو پەیمانە، برایەتیی‌و پەیمانی نێوان کۆچکەران‌و پشتیوانان (المهاجرون والأنصار)ە، کە دیارە کۆچکەران زۆربەی هەرەزۆریان لەهۆزی قوڕەیش بوون.

دیارە مەبەستی ئەنەسیش لەو وەڵامە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جۆرە پەیمان بەستن‌و هاوپەیمانێتییەکی قەدەغە نەکردوە، بە بەڵگەی ئەوە کە خۆی لەنێوان کۆچکەرانی مەککەو پشتیوانانی مەدینەدا پەیمانی بەستوە! جائێمە بەر لەوەی قسەو شیکردنەوەی زانایان لەوبارەوە بەدرێژیی بخەینەڕوو، پوختەکەی دەخەینەڕوو و دەڵێین:

زانایان گوتوویانە:

چۆنیەتی پێکەوە کۆکردنەوەو گونجاندنی ئەو ئایەت‌و فەرمایشتانە

ئەوەیە ، كە:

مەبەست لە هاوپەیمانێتیو پەیمان بەستنی قەدەغەكراو، ئەو جۆرەیە كەلەسەر ناهەق بێو پێچەوانەی شەریعەت بێ، وەمەبەست لەهاوپەیمانێتیو پەیمان بەستنی ڕەوا، ئەوەیە كە لەبازنەی شەریعەت دەرنەچێت، وەك چەسپاندنی دادگەرییو یارمەتی دانی ستەملێكراو و هێنانەدی بەرژەوەندییەكی ڕاستو ڕەوا.

ئنجا باسەرنجی قسەو شیكردنەوەی سێ لەزاناو پێشەوایانی ناودارمان بدەین لەوبارەوە:

**یەك: (النووي) خوا لێی خۆشبێ لەوبارەوە گوتوویەتی[1]:**

(قال القاضي: قال الطبري: لايجوز الحلف اليوم فأن المذكور في الحديث والموارثة به وبالمؤاخاة كلّه منسوخ، لقوله تعالى: ﴿... وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ...﴿٦﴾ الأحزاب﴾، وقال الحسن: كان التوارث بالحلف، فَنُسِخَ بآيةِ المواريث، قلت: أمّا مايتعلّقُ بالأرث فَيُستَحبُّ فيه المخالفة عند جماهير العلماء، وأما المؤاخاة في الأسلام والمُحالَفَةَ على طاعة الله تعالى والتناصر في الدين والتعاون على البرِّ والتَّقوى وإقامة الحق، فهذا باقٍ لم يُنْسَخْ وهذا معنى قوله في هذه الأحاديث: ((**وأيـمّا حلفٍ كان في الجاهلية لم يَزِدْهُ الأسلام الاّشِدَّةً**))، وأما قوله: ((**لاحِلْفَ في الأسلام**)) فالمراد به: حِلْفُ التوارثِ، والحِلْفُ على مامنع الشرع منه، والله

1) شرح صحيح مسلم، ج16، ص(82-81).

أعلم)، واتە: قازی گوتوویەتی: (طبـري) دەڵێ: ئەم ڕۆژگارە هاوپەیمانێتی دروست نیە، چونكە ئەوەی كە لـە فەرموودەكـەدا باسـكراوە، وە مـیرات پێگرتنیو میرات گرتن بەبرایەتی، هـەمووی نەسـخ كراوەتـەوە، چـونكە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وە خزمـان لـە كتێبـی خـوادا بـۆ یەكـدی لـە خەڵكی دیكە لە پێشترن﴾ وە (حەسـەن[1]) گوتوویـەتی: مـیرات گـرتن كاتی خۆی بەهاوپەیمانێتی بوو، بەڵام بەئایەتی میراتـەكان لابـرا، منـیش دەڵێم: ئەوەی كە پەیوەستە بە میراتەوە لەلای جەماوەری زانایان

واپەسندە سەرپێچی پەیمانە پێشووەكەی تێدا بكـرێ، بـەڵام برایـەتیی ئیسلامییو هاوپەیمانێتی لەسەر فەرمانبەرییكردنی خوای بەرزو، پشـتی یەكدی گرتن لـە دینداریـداو هاوكـاریی لەسـەر چـاكەو پارێزكـارییو، بەرپاكردنی هەق، ئەوە بەردەوامەو لانـەبراوە، وە ئەمـەش مەبەسـتە بـۆ قسەكەی لەم فەرموودانەدا، (وە هەر پەیمانێك لە سەردەمی نەفامێتیـدا بووبێ، ئیسلام هەر پتەوتری كردوە)، بەڵام ئەوە كە دەڵێ: (هاوپـەیمانێتی لە ئیسلامدا نیە) ئەوە مەبەست پێی پەیمانی میراتگرتنو پەیمانە لەسەر هەرشتێك كە شەریعەت ڕێی لێگرتوە، خواش زاناترە)).

**دوو: (إبن حجر العسقلاني)یش خوا لێی خۆشبێ لەوبارەوە گوتوویەتی[2]:**

(وتَضَمَّن جوابُ أنسٍ إنكار صدر الحديث، لأن فيه نفي الحِلْـفِ، وفيمـا قالَهُ هو إثباتُهُ، ويمكن الجمعُ بأن المنفيَّ ماكانوا يعتبرونه في الجاهليـة مـن نصر الحليفٍ ولوكان ظالِماً، ومن أَخْذِ الثأر من القبيلة بسبب قتـل واحـدٍ

1) مەبەست حەسەنی بەصراییە، خوا لێی رازی بێ.
2) فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج10، ص520.

منها، ومن التوارث ونحو ذلك، والمثبت هو ماعدا ذلك، من نصر المظلوم والقيام في أمرِ الدِّين ونحو ذلك من المُسَتَحبّات الشرعيَّة كالمصادقةِ والموادِدة وحفظ العهد)، واتە: وە وەڵامەكەی ئەنەس نكوولّییكردنی سەرەتای فەرموودەكەی گرتۆتەخۆی[1]، چونكە لەوێدا هاوپەیمانێتی لابراوە، بەڵام ئەوەی ئەو (واتە: ئەنەس) گوتوویەتی: چەسپاندنی هاوپەیمانێتی یە!

دەشگونجێ هەردووكیان كۆبكرێنەوە، بەوە كە بگوترێ: ئەوەی لابراوە ئەوە بووە كەلەڕۆژگاری نەفامێتیدا باوبووە، وەك: سەرخستنی هاوپەیمان ئەگەر ستەمكاریش بێ، وە وەك تۆڵە ستاندنەوە لەتیرەیەك بەهۆی ئەوەوە كە یەكێك لەتیرەكەی بەرانبەر كوژراوە، وە وەك میرات لەیەكدی گرتنو وێنەی ئەوانە، بەڵام چەسپێنراو (لە هاوپەیمانێتی) غەیری ئەوانەیە، وەك: یارمەتیدانی ستەمدیدە، وە بەڕێوەبردنی كاروباری ئایینو وێنەی ئەوانە، لەوشتانەی كە پەسندیدەی شەریعەتن، وەك برادەرایەتیو دۆستایەتیو وەفاداریی)).

## سێ: (إبن الأثير)یش خوا لێی خۆشبێ هەر لەوبارەوە گوتوویەتی[2]:

(أصل الحِلْفِ: المعاقدة والمعاهدة على التعاضُدِ والتساعُدِ والأِتِّفاق، فما كان منه في الجاهلية على الفتن والقتال بين القبائل والغاراتِ، فذلك الذي

---

1) واتە: نكوولّییكردنی ئەنەس خوالێی ڕازی بێ لەوە كە ئەو قسەیە پێغەمبەر ﷺ كردبێتی، نەك نكوولّیی لە ڕاستیی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ، كە دیارە ئەوە كوفرە!

2) النِّهاية في غريب الحديث والأثر، ج1، ص(425–424).

وردَ النَّهيُ عنه في الأسلام بقوله: ((لاحِلْف في الأسلام)) وماكان في الجاهلية من نصر المظلوم وصلة الأرحام-كحلف المُطَيِّبين وما جرى مجراه- فذلك الذي قال فيه ((وأيّما حلفٍ كان في الجاهلية لم يَزِدْهُ الأسلام الاّشِدَّةً)) يريدُ من المعاقدة على الخير ونُصْرة الحق، وبذلك يَجتمِعُ الحديثان، وهذا الحلف الذي يقتضيه الأسلامُ، والممنوعُ منه ما خالَفَ حكم الأسلام..)، واتە: ﴿وشەی (حلف) لە بنەڕەتدا یانی گرێبەستو پەیماندان لەسەر پشتگیریی‌و هاوكاریی‌و ڕێككەوتن، جا ئەوەی كە لە ڕۆژگاری نەفامێتیدا لەسەر ئاژاوەو كوشتارو ڕاووڕووتی نێوان تیرەكان بووبێ، ئەوە ئەو جۆرەیە كە لە ئیسلامدا قەدەغەكراوە بە فەرموودەی: (هاوپەیمانێتی لەئیسلامدا نیە)، بەڵام ئەوەی كەلەڕۆژگاری نەفامێتیدا بۆیارمەتیدانی ستەملێكراوو گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتی بووبێ -وەك پەیمانی بۆنخۆشكەران هاووێنەی وی- ئەوە ئەو جۆرەیە كە لەبارەیەوە فەرموویەتی: (وە هەر هاوپەیمانێتییەك لە نەفامێتیدا بووبێ، ئیسلام هەر پتەوتری كردوە) كەمەبەستی پەیمان بەستنە لەسەر چاكەو سەرخستنی هەق، وە بەمەش هەردووك فەرمایشتەكە كۆدەبنەوە (واتە: دژی یەك نابن، وەك بە ڕواڵەت وایە[1])، وە ئەم جۆرە هاوپەیمانێتییەشە كە ئیسلام دەیخوازێ‌و ئەوەش كە ڕێی لێگیراوە بریتیە لەوە كە پێچەوانەی حوكمی ئیسلام بێ﴾.

بەڕێزان!

پێم وایە پاش ئەم برە توێژینەوەیەش لەبارەی چەند فەرموودەیەكەوە كە ڕواڵەتەكەیان قەدەغەكردنی هاوپەیمانێتی (تحالف) بەشێوەیەكی ڕەهاو بە

1) ئەوەی نێوان دووكەوانەكە خۆم زیادم كردوە، بەمەبەستی ڕوونكردنەوەی واتا.

گشتی دەگەیەنن، باش باش ڕوونبۆوە كە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو فەرموودانە شتێكی دیكەیە، كە بریتیە لە: قەدەغەكردنو ڕێ لێگرتنی ئەو جۆرە هاوپەیمانێتیو ڕێككەوتنانە كەلەسەردەمی نەفامێتیدا لەپێناو ئامانجو مەبەستی خراپو ناشەرعییانەدا دەبەستران، ئەگەرنا پەیماندانو ڕێككەوتن بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجی ڕاستو ڕەواو شەرعیی، نەك هەر هیچ ئیشكالێكی تێدا نیە، بەڵكو وەك هەر بابەتێكی دیكەی بواری عادەتو هەڵسو كەوتەكان (العادات والمعاملات) لە ئەسڵدا ڕەوا (مُباح)یەو، جاری واش هەیە حوكمەكەی دەگۆڕێ بۆ پەسندیی (إستحباب)و بگرە پێویستیی (وجوب)یش، بەپێی بنچینەی شەرعیی: (ما لايتم الواجب الاّ به فهو واجب): هەرشتێك فەرزێك پەكی لەسەری كەوت فەرزە، وە بنچینەی: (للوسائل حكم المقاصد): ئامرازەكان حوكمی ئامانجەكانیان هەیە.

بسم الله الرحمن الرحيم

بەڕێزان!

ئاڵقەی ئەمجارەی بەرنامەکەمان سەبارەت بە هاوپەیمانێتییە، ئێمە دەمانەوێ بزانین ئایا لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە هاوپەیمانێتی هیچ بەڵگەو پاساوێکی شەرعیی هەیە؟ بە تایبەت هاوپەیمانێتییەك کە لە نێوان دوو بۆچوونی جیاواز، لایەنێکی ئیسلامیی‌و لایەنێکی عەلمانی، یان نیشتیمانییدا ببەسترێ، ئیسلامییەکان چۆن دەتوانن قەناعەت بەو کەسانە بکەن کە پێیانوایە ناکرێ دوو لایەنی ئیسلامیی‌و عەلمانیی، یان ئیسلامیی‌و غەیرە ئیسلامیی پێکەوە کۆببنەوە.؟

+ سڵاوی خوای گەورەت لێبێ بەڕێز مامۆستا !

ـ وعليكم السلام ورحمة الله، سڵاو لە تۆش بێ.

+ بەڕێز مامۆستا! لە دەروازەی بەرنامەکەماندا دەمانەوێ لە پێناسەی هاوپەیمانێتییەوە دەست پێبکەین، هاوپەیمانێتی چییە؟! هاوپەیمانێتیی بۆچی؟ بۆچی پێویستە خەڵکێك یان دوو، یان سێ چوار لایەن پەنا ببەنە بەر هاوپەیمانێتی؟ پاشانیش دەچینە سەر هاوپەیمانێتیی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە.

ـ بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه، هاوپەیمانێتیی کە

لە زمانی عەرەبییدا وشەی (تحالف)ی بۆ بەکاردێ، یان (إتفاقیة)، وشەی (حلف) لە زمانی عەرەبییدا واتە (پەیمان) کە بەو بەڵێن و پەیمانەیان وتوە کە دوو کەس یان دوو تیرە یان دوو لایەن، یان زیاتر پێکەوە دەیبەستن، دیارە (تحالف) هەر لە وشەی (حِلْف)ەوە هاتوە لەسەر کێشی (تفاعل)، واتە (پەیمان پێکەوە بەستن)، وە لە زمانی کوردییدا ئێمە دەڵێین: هاوپەیمانێتیی یاخود ڕێککەوتن، دیارە لەڕووی شەرعییەوە وە لە ڕووی عورفییەوە، هیچ ئیشکالێك نیە لەسەر ئەوە کە دوو نەفەر یاخود دوو لایەن، یاخود چەند لایەنێك بەیەکەوە پەیمان ببەستن و عەقدێکیان لە بەیندا هەبێت کە هەردوو تەرەف یان هەموو تەرەفەکان لەگەڵ یەکتردا بۆ هێنانەدی ئامانجێکی هاوبەش، یان ئامانجە هاوبەشەکان تێبکۆشن، وە ئەرك و مافیشیان لە بەیندا دابەش بکرێ، هەڵبەتە هەر کەسە بەپێی قەبارەی خۆی، وە ئەو مەسەلەی پەیمان پێکەوە گرێدانە شتێکی مەعهوودە بە درێژایی مێژوو، هەر لەوکاتەوە کە مرۆڤایەتی هاتۆتە نێو شارستانییەوەو، کیان و قەوارە سیاسیی و پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی بەشەریی بە یەکەوە هەڵسوکەوتیان بووە، ئەو مەسەلەی پەیمان پێکەوەبەستن و ئیتیفاق پێکەوە کردنە، هەر بووە، لە ڕووی شەریعەتی ئیسلامییشەوە لەبناغەدا ڕەوایە، بەڵام دیارە کۆمەڵێك ڕێساو یاسای بۆ دانراو بەرەهایی بەرهەڵدا نەکراوە، بەڵکو چوارچێوەیەکی بۆ دانراوە کە دەبێ بەو شێوەیە بکرێ و خۆ لە فلان شتە بپارێزرێ، وە ئەگەر فلان مەرجەی تێدا نەبێ ڕەوا نیە، وە

ئەگەر فلان شتەی تێدا بێ ئەوە حوکمەکەی بەو شێوەیە دەگۆڕێ، لە کاتی قوەتدا ئاوایەو لەکاتی بێدەسەڵاتییدا یان کەمهێزییدا بەو

شێوەیەو... هتد، شەرعزانان قسەیان زۆر لێوە كردوە.

+ مامۆستا! بێگومان ئێمە باس لە هاوپەیمانێتیی سیاسیی دەكەین، بە دیارییكراوییش باس لە هاوپەیمانێتیی چوار حیزبەكە دەكەین، بێگومان ئێوە وەكو كۆمەڵی ئیسلامیی كە بەڕێزت ئەمیری كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستانیت، یەكگرتووی ئیسلامییش، بە دیدو تێڕوانینی جیاوازی خۆتان، ئیسلام وەكو مەبدەءو فیكر تەبەننی دەكەن، لەگەڵ دوو حیزبدا هاوپەیمانێتیتان بەستوە كە غەیری ئایینی پیرۆزی ئیسلام تەبەننی دەكەن، جا ئایا ئێوە بەڵگە شەرعییەكانتان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا چین كە دەتوانن دەستكراوە بن لە بەرانبەر ئەم هاوپەیمانێتییەدا؟ یانی ئێوە پشتتان بە چ بەڵگەیەك بەستوە لە ئایینی ئیسلامدا، چونكە ئەوانەی شوێنكەوتەی ئێوەن، بەڕاستیی چاوەڕێی ئەوەن بەڵگەتان هەبێ بۆ ئەو هاوپەیمانێتییە لەگەڵ دوو لایەنی جیاواز لە خۆتان؟

- پێشەكی دەمەوێ دوو مەسەلە ڕوون بكەمەوە: یەكەم: ئەو دوو لایەنەی ئێمە ئەم لیستە هاوبەشەمان لەگەڵ دروست كردوون، بەیەكەوە پێشینەیەكمان هەبووە، هەر لە كاتی پێكهێنانی ئەنجوومەنی باڵای پارتە سیاسییەكانو لەوەپێشیش لەسەر گۆڕەپانی كوردستان ئاشنایەتییمان پێكەوە هەبووە، وەكو باقی لایەنەكانی دیكە، بە تایبەت ئەو چوار لایەنە بە یەكەوە هاوهەنگاویی‌و هاوهەڵوێستییمان هەبووە، هەموو لایەك ئاگادارن ئێمە كاتی خۆی یاداشتنامەیەكماندا بە سەرۆكی هەرێمو سەرۆكی پەرلەمانو سەرۆكی حكومەت، دوایی ئەو

یاداشتنامەیەمان كردە پرۆژەیەكی چاكسازیی، دیسان بە شێوەی تایبەت دامان بە شوێنە بڕیاربەدەستەكان، دوایی ئەوە بوو لە قۆناغی سێیەمدا ئێمە ئەو پرۆژە چاكسازییەمان لە دووتوێی ڕاپۆرتێكدا بۆ ڕای گشتیی بلاو كردەوە، دیارە لەو كاتەوە برادەرانی پارتیو یەكێتیی بە تەنگەنەفەسییو گرژییەكەوە لەگەڵ بلاوبوونەوەی ئەو ڕاپۆرتە ڕووبەڕوو بوونەوە، كە پێموایە دوایی زیاتر بەسەر خۆیاندا شكایەوە، ئێمە ئاوا پێشینەیەكی بەو جۆرەمان پێكەوە هەبووە، ڕوونكردنەوەی دووەمیش: مەبەستمە ئەوەش بلێم كە ئەو دوو لایەنە لەڕووی فكرییەوە لەیەك جیان، هەرچی حیزبی سۆشیالیست دیموكراتی كوردستانە، سكرتێرەكەی چەندان جار تەئكیدی كردۆتەوە كە ئەوان خۆیان بە لایەنێكی عەلمانیی نازانن، دەڵێ ئێمە لایەنێكی نەتەوەیین، لایەنێكی نیشتیمانیین، بەلام كاك قادر عەزیزو ئەو بەشەی زەحمەتكێشان كە لەگەڵی ماوەتەوە، ئەوان خۆیان بە عەلمانیی دەزانن، كەواتە: ئەو دوو لایەنە لەیەك جیان لەڕووی فكرییەوە، واتە هەر كەسە پێویستە وەكو خۆی پێناسەی بكەین، وەكو ئەوەی كە خۆی دەیەوێ پێناسە بكرێو خۆی دەناسێنێ، بەكورتی: ئەو لیستە هاوبەشەمان پێشینەی هەیە.

+ پێشینەیەكی كاركردن؟

- بەڵێ ڕەگو ڕیشەی پێشتری كاركردنمان پێكەوە هەیە، دیارە لەوانەیە پێویست بكات دواتر زیاتر تیشك بخەمە سەر ئەم مەسەلەیە، بەلام جارێ لە ڕووی شەعبییەوە جەنابت پرسیار دەكەی.

+ بەڵێ.

ـ ئایا چ بەڵگەیەکی شەرعیی هەیە لەوبارەوە کە لایەنێکی ئیسلامیی یان چەند لایەنێکی ئیسلامیی لەگەڵ لایەنێکی غەیرە ئیسلامییدا هاوپەیمانێتی بکەن، جا هەر ئینتیمایەکی فکریی هەبێ، یاخود کارێکی هاوبەش بکەن؟ لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵگەی شەرعیی لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

**بەڵگەی یەکەم:** وەکو زۆر جاری دیکە گوتوومانە شەرعزانان هەموو لەسەر ئەو بنچینە شەرعییە یەکدەنگن کە پێویستە هەمیشە ئێمە کە دێینە نێو بازنەی هەڵسوکەوت و عادەتەکانەوە، ئەو بنچینە شەرعییەمان لەبەر چاو بێت، ئەگەرنا دوایی هەر بە دەستی خۆمان خۆمان عاسێ دەکەین و زوڵمیش لە شەریعەت دەکەین، بنچینە شەرعییەکەش ئەوەیە کە دەڵێ: بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا دەستکراوەییە، "الأصل في المعاملات الإباحة"، یان (بناغە لەعادەتەکاندا بواردرانە)، " الأصل في العادات العفو"، دیارە مەبەست لە عادەت و موعامەلات، هەڵسوکەوتی ئینسانەکانە لەنێو خۆیاندا، هەڵسوکەوتی ئینسانەکان لەنێو خۆیاندا ئەسڵ و بناغە تێیدا دەستکراوەیی و ڕەواییە، واتە: هەموو جۆرە هەڵسوکەوت و عادەتێك ڕەوایە، مەگەر ئەوە کە بە دەقێکی شەرعیی قەدەغە کرابێ، بە پێچەوانەی عیبادەتەوە، کە بناغە تێیدا ڕێ لێگیران و قەدەغەبوونە "الأصل في العبادات الحظر الاّ ما شرعه الشرع"، واتە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا بریتییە لە قەدەغەکران یاخود ڕێلێگیران، مەگەر ئەوە کە شەرع ڕێگەی دابێ، واتە بە پێچەوانەی

حاڵەتی یەكەمەوە، ئەویش لەسۆنگەی ئەوەوە كە عیبادەت بریتییە لە هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ خوا (سبحانه وتعالی)داو خواش بەس بۆ خۆی دەزانێ دەبێ چۆن هەڵسوكەوتی لەگەڵدا بكەی؟ چۆن بەندایەتی بۆ بكەی؟ چۆن ئیمانی پێ بێنێ؟ چۆن بیپەرستی؟ چۆن یادی بكەی؟ ئەوە هەر خوا دەیزانێ، لەبەر ئەوە هەر ڕێیەك خوا دیاریی نەكردبێت لە بواری پەیوەندیی لەگەڵ خوادا، كە پێی دەوترێ عیبادەت، قەدەغەیە، بۆیە هەر شتێك لە بواری عیبادەتدا زیاد بكرێ، بە داهێنراو (بدعة) لەقەڵەم دەدرێ، بە پێچەوانەی عادەتو هەڵسوكەوتەكانەوە كە ئەسڵ تیایاندا داهێنانە، بۆیە دەتوانین وەك بنچینەیەك بڵێین: "الأصل في المعاملات الإبداع"، ئەسڵ لە هەڵسوكەوتەكاندا بریتییە لە داهێنان، "والأصل في العبادات الإتِّباع"، وە بناغە لە عیبادەتەكاندا بریتییە لە شوێنكەوتن، واتە شوێنكەوتنی شەرع، كەواتە: ئێمە بۆ ئەوەی بیسەلمێنین هاوپەیمانییكردن لەگەڵ لایەنێكی غەیرە ئیسلامییدا ڕەوایە، ئەوەندە بەسە كە هیچ دەقێكی شەرعیی لەسەر ناڕەوابوونی نەبێ، ئیدی ئەوكاتە مانای وایە لەسەر ئەسڵی خۆی كە ڕەوایی (إِباحة)یە ماوەتەوەو پێویستییمان بە بەڵگە هێنانەوەی دیكە ناكات، ئنجا كە دەڵێین: غەیرە ئیسلامیی، بەڕاستیی دەمەوێ كە هیچ كەس بە هەڵەدا نەچێو بزانێ مەبەستمان ئەوە نیە كە حوكمی نامسوڵمانەتیی بەسەر تاكەكانی ئەو لایەنانەدا بدەین، چونكە مەرج نیە ئەو كابرایە كە دەڵێ: ئیسلامیی نیم! لە زاتی خۆیدا نامسوڵمان بێ، بەڵێ مەرج نیە، كە تۆ گوتت ئەوە لایەنێكی غەیرە ئیسلامییە،

یەکسەر لە بازنەی ئیسلامەت بردبێتە دەرەوە، بەڵکو ئەو لایەنە خۆی لەژێر لافیتەی ئیسلامییدا نابینێتەوە، بەڵام مەرج نیە هەر کەسێك خۆی وەکو لایەنێکی نەتەوەیی‌و نیشتیمانیی ناساند، لەگەڵ ئیسلامدا تێك بگیرێ، چونکە لایەنی نەتەوەیی‌و نیشتیمانیش بەشێکە لە مسوڵمانەتیی‌و لە دینداریی، منێکی ئیسلامییش لایەنی نەتەوەیی خۆمم هەیەو لایەنی نیشتیمانیی خۆمم هەیە، ئنجا خوای پەروەردگار هەموو شەریعەتەکانی خۆی ناردوە بۆ بەختەوەرکردنی خەڵك‌و ئینسانەکان، وە ئینسانەکان دابەش دەبنەوە بۆ نەتەوەو بۆ تیرەو هۆزەکان، وە لە ڕووی جوگرافییەوە دابەش دەبن بۆ چەند نیشتیمانێك، کەواتە سەرەنجام ئێمە پێویستییمان بە نیشتیمانێك هەیە چالاکیی تێدا ئەنجام بدەین، وە پێویستییمان بە چوارچێوەی نەتەوەیەك یان چەند نەتەوەیەکە کە کارەکەمانی تێدا ئەنجام بدەین، مانای وایە خۆپێناسەکردن بە لایەنێکی نیشتیمانی یان نەتەوەیی، دژ ناوەستێتەوە لەگەڵ مسوڵمانەتییدا، چونکە ئیسلام لایەنی نیشتمان‌و نەتەوەشی تێدایە، بەڵام دیارە بە ڕێکوپێککراوی‌و بە سنووربۆدانانەوە، وەکو زۆر جار گوتوومە ئێمە لەگەڵ نەتەوە دۆستییداین، بەڵام لەگەڵ نەتەوەپەرستییدا نین، نیشتیمان دۆستین، بەڵام نیشتیمانپەرست نین، ئێمە نیشتیمان‌و خەڵك‌و نەتەوەی خۆمان خۆش دەوێ‌و بە عیبادەتی دەزانین خزمەتیان پێبکەین، بەڵام نیشتیمان دۆستیی جیا دەکەینەوە لە نیشتیمانپەرستیی، ئێمە لەگەڵ وەتەنییەت (وطنية)ین، بەڵام لەگەڵ وەسەنییەت (وثنية) نین، نیشتیمان‌و وڵاتی خۆمانمان خۆش دەوێت، بۆچی؟ چونکە ئێمە هەر

دین‌و فكرەیەكمان هەبێت، سەرەنجام دەبێت سەرزەمین‌و خاكێكمان هەبێت ئەو دین‌و فكرەیەی تێدا پیادە بكەین، پاشان خۆشویستنی خەڵك‌و خاكیش شتێكی خوارسك (فطري)ەو هەموو مرۆڤێك هەیەتی، بۆیە گرنگە ئەوەش بزانرێ كە ئێمە وەكو دوو لایەنی ئیسلامیی مەرج نیە لە هەموو ڕوویەكەوە لەگەڵ ئەو دوو لایەنە كە هاوپەیمانییمان لەگەڵ كردوون، یان لیستێكی هاوبەشمان لەگەڵ دروست كردوون، یان لەگەڵ هەر لایەنێكی دیكەشدا كە بە یەكەوەش نین لەم لیستە هاوبەشەدا، مەرج نیە لەگەڵ هەموو شتێكیاندا تێكبگیرێین، ئێمە بە تەئكید لەگەڵ ناشەرعییەكانی هەر كەسێكدا تێك دەگیرێین، ئەگەر خۆشمان بێ، بەڵام تەنیا لەگەڵ شتی ناشەرعییدا تێك دەگیرێین، ئەگەرنا ئێمە خاڵی هاوبەشمان خۆ هەر لەگەڵ ئەو دوو لایەنەدا نیە، ئێمە چەند ساڵە لەم وڵاتەدا لەگەڵ پارتی‌و یەكێتی‌و باقی لایەنەكانی دیكەدا هاوكار بووین، هاوپەیمانییمان لەگەڵیاندا هەبووەو، ئێستاش هاوكارین، لە وڵاتێكداین‌و یەك پرۆسەی سیاسیی كۆمان دەكاتەوە، یەك ئەزموون‌و وڵات هەموومان كۆ دەكاتەوە، بەڵێ مانای وانیە كە تۆ لە چەند ڕوویەكەوە بیرو بۆچوونت جیایە، لە هەموو ڕوویەكەوە جیای، تەنانەت خوا (سبحانه وتعالى) بانگی جوولەكەو نەسرانییەكان دەكات‌و دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ ...﴿٧١﴾ آل عمران﴾، واتە: ئەی خاوەن كتێبەكان بۆچی حەق‌و باتڵ تێكەڵ دەكەن؟ واتە شتی ڕاستتان پێیە، بەڵام لەگەڵ شتی ناڕاست تێكەڵی مەكەن.

**بەڵگەی دووەم:** بەڵگەیەکی دی ئەوەیە کە ئێمە کاتێك تەماشای سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەکەین، دەبینین هاوپەیمانێتیی کردوە لەگەڵ ئەوانە کە غەیری خۆی بوون، غەیری خۆی واتە غەیری پێغەمبەر ﷺ، کە ئەوکاتە پێغەمبەر یەکسان بووە بە ئیسلامو هەر کەسێ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەبووبێ مسوڵمان نەبووە، دیارە جاری دیکەش باسم کردوە کە ئێمە ناتوانین ئەو ئیددیعایە بکەین‌و قەتیش نەمانکردوە، کە ئێمەش وەك پێغەمبەر ﷺ یەکسانین بە ئیسلام، هەرچەندە دوژمنان‌و ناحەزانیش ئەو تۆمەتانەمان دەدەنە پاڵ، بەلاَم چەندان جار ئەو تۆمەتەمان ڕەت کردۆتەوە، کەچی ئەوان وەکو قەوانێکی سواو هەر دووبارەی دەکەنەوە، کە لە ڕاستییدا ئەوە هەر شەڕ پێ فرۆشتن‌و گێچەڵ پێکردنە، ئەگەرنا ئێمە چەندان جار گووتومانە ئێمە ئیددیعای ئەوەمان نەکردوەو ناکەین کە ئێمە یەکسانین بە ئیسلام، وە یەکسانیش نین، چونکە ئێمە لایەنێکی ئیسلامیین، ئێمە کۆمەڵێکین لە مسوڵمانان‌و مەرج نیە هەر کەسێك لەگەڵ ئێمە نەبێ، مسوڵمان نەبێ، بەڵێ ئێمە لایەنێکین خزمەتی ئیسلام دەکەین، ئەگەر کەسێك بە ڕێی عەلمانییەتدا دەڕوا، ئەوی دیکە بە ڕێی مارکسیزمدا دەڕوات، ئەوی دیکە بە ڕێی لیبرالیزمدا دەڕوات، ئێمە بە ڕێی ئیسلامدا دەڕۆین، ئیدی ناشڵێین هەر کەسێك لەو خەت‌و ڕێبازەدا بە مانا حزبییەکەی لەگەڵمان نەبێ‌و لە چوارچێوەی حیزبەکەی ئێمەدا نەبێ، ئیسلامیی نیەو مسوڵمان نیە، چونکە وەك زۆر جار گوتوومە: ئیسلامیبوون، واتە: تەبەننی کردنی ئیسلام، کە لە قورئان‌و سوننەتدا بەرجەستەیە،

ئیدی هەر کەسێك بڵێ قورئانو سوننەت بەرنامەی ژیان بنو شەریعەتی خوا بەرنامەی ژیان بێ، ئەوە ئیسلامییە ئەگەر لە چوارچێوەی ڕێکخراو و حیزبێکی ئیسلامییشدا نەبێت، بەڵام بە تەئکید هەرکەسێك نکوولیی بکات لە ئیسلام، جا لە هەموو ئیسلام نکوولیی بکات، یان لە بەشێکی، تەنانەت لە یەك لە یاسای بە ئاشکرا زانراوی ئیسلام، کە زانایان زاراوەی: (ما علم من الدين بالضرورة) یان بۆ بەکارهێناوە، واتە: ئەوەی کە هەموو کەسێك بە ئاشکرا دەزانێ ئەوە یاسایەکی ئیسلامە، هەر کەسێك نکوولیی لێ بکا، لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەرێ، ئەوە ئیجماعو یەکدەنگیی هەموو زانایانی لەسەرە کە (الرضا بالكفر، كفر)، ڕازیی بوون بە کوفر، کوفرە، وە ڕەفزی ئیسلامیش هەمووی یان بەشێکی (كلاً أو جزاً)، ئەوەش هەر کوفرە، کەواتە: ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە.

+ نموونەکانی سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە چین؟!

ـ بەڵێ پێغەمبەر ﷺ، هاوپەیمانێتی کردوە لەگەڵ جوولەکەکاندا، کە ئەوە کە ئەوە زەقترین نموونەیە لە مێژووی پێغەمبەردا ﷺ، کاتێك پێغەمبەری خوا دەچێتە مەدینە سێ ئیشی گەورە دەکات، کە ئەوە لە هەموو کتێبەکانی مێژوودا نووسراوە، بەتایبەت سیرەی (ئیبنو هیشام) [1]: یەکەم ئیشی ئەوەبوو کە برایەتیی بەرپا کرد لە نێوانی کۆچکەرانو پشتیوانانادا، بۆ ئەوەی لە ڕووی هاوسەنگیی گوزەرانو ژیانەوە ئەو ناهاوسەنگییەی هەبوو، ڕاستی بکاتەوە، کە بۆ کاتێکی

---

1) السيرة النبوية لابن هشام، ج1، ص(265–259)، دار ابن الهيثم.

دیاریکراو لە هەموو شتێکی یەکتردا بەشداربوون، ئیشی دووەمی ئەوەبوو کە مزگەوتی دروست کرد، وە ئیشی سێیەمی ئەوە بوو کە وەسیقەیەکی نووسی، کە سەحیفەشی پێ وتراوەو کیتابیشی پێ گوتراوە، لە نێوانی پێغەمبەر ﷺ مسوڵمانان لەلایەکو، تیرە جوولەکەکان لە لایەکی دیکەوە، ئەو تیرە جوولەکانەی کە لە نێو مەینەدا بوون، دیارە ئەو (صحیفة)یە کە لە جێی دەستووری ئێستابوو، ئەركو مافەکان تێیدا دابەش کراونو ئامانجە هاوبەشەکانی تێدا دیاریی کراون، وە باسکراوە کە هەر کەسێك هێرش بکاتە سەر مەدینە، ئەهلی ئەم سەحیفەیە هەموویان یەکدەستن لە بەرانبەردا، واتە: بەرگرییکردنی هاوبەشیشی تێدا ڕاگەیەنراوە، شایانی باسە ئەو سەحیفەیە لە (47) مادده پێکهاتوە، کە ئێستا مەجال نیە بە درێژیی باسی بکەین، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ لایەنێکی نا مسوڵماندا ئەو وەسیقەیەی مۆر کردوە.

**<u>بەڵگەی سێیەم</u>:** لە حودەیبییەدا پێغەمبەر ﷺ پێکهاتنو سوڵحی حودەیبییە دەکات، لەگەڵ کێدا؟ لەگەڵ هۆزی کافری قوڕەیشدا، کە بۆ ماوەی (10) ساڵ جەنگ ڕادەگرنو پێکەوە دەکەونە حاڵەتی ئاشتیو هێمنییەوە، جا لەوکاتەدا کە ئەو سوڵحو پێکهاتنە ئیمزا دەکرێ، دوو تیرەی پێکەوە ناکۆك دەبن، وەکو لە سەحیحی (بخاری)و (مسلم)و (سیرە ابن هشام)دا هاتوە[1]، کە خوێن لە نێوانیاندا هەبووە، ئەوانیش (بەنو بەکر و خوزاعە) بوون، (بەنو بەکر) دەڵێن:

---

1) هەمان سەرچاوە، ج3، ص(162176).

ئێمە لەگەڵ قورەیشدا دەبینە هاوپەیمان، (خوزاعە)ش دەڵێن: ئێمە لەگەڵ موحەممەددا ﷺ دەبینە هاوپەیمان، ئیتیفاقییەکەشیان وابووە، واتە: سوڵحی حودەیبییە وابووە کە هەرکەسێك بوو بە هاوپەیمانی یەکێك لەو دوو لایە، حوکمی ئەو لایەی هەیە، واتە پێغەمبەر ﷺ دێنێ هاوپەیمانێتیی دەکات لەگەڵ (خوزاعە)دا کە تیرەیەکی بتپەرستن، وەکو چۆن (بەنوبەکر)ی دوژمن و مونافیسیشیان دەبنە هاوپەیمانی قورەیش، ئنجا دوایی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا چ شتێك دەبێتە بەڵگەو پاساوی ئەوە کە بچێ مەککە ئازاد بکات؟! بێگومان ئەوە کە (بەنوبەکر)ی هاوپەیمانی قورەیش، دەچن شەبەیخون دەکەنە سەر (خوزاعە)ی هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ، کە هەردووکیشیان موشریك و بتپەرستن و (20)کەسیان لێ دەکوژن، ئنجا (عمرو بن سالم)ی خوزاعی کە سەرۆکی تیرەی خوزاعەیە دەچێ بۆ مەدینەو سکاڵای خۆی دەکات لای پێغەمبەر ﷺ، لای هاوپەیمانەکەی و دەڵێ: ئەی موحەممەد! بەنوو بەکر تیرەی هاوپەیمانی قورەیش هاتن لە شەبەیخووندا بەسەر ئێمەیاندادا و (20) کەسیان لێ کوشتووین، ئێمەش هاوپەیمانی تۆین، دیارە ئەو شیعرێکی درێژ دەخوێنێتەوە کە لە سیرەی (ابن هشام)دا شیعرەکە هاتوە[1]، پێغەمبەریش ﷺ بە یەك دێڕ وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێ: (نُصِرْتَ یا عَمرو بن سالم)، سەرخرای ئەی عەمری کوڕی سالم، پشتیوانیت لێدەکەین، وە سەرەنجام پێغەمبەر ﷺ دوایی دەچێ مەککە ئازاد دەکات، چونکە قورەیش پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە، بۆ؟

---

1) هەمان سەرچاوە، ج4، ص221.

چونکە لە هاوپەیمانی پێغەمبەریان داوە! کەواتە: لێرەدا پێغەمبەر ﷺ هاوپەیمانێتیی کردوە لەگەڵ تیرەیەکی نامسوڵماندا، نەك بۆ پرۆسەیەکی سیاسیی وەك هەڵبژاردن، بەڵکو بۆ شەڕ لەسەر یەکترکردن!!

**<u>بەڵگەی چوارەم و پێنجەم:</u>** پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو پەیماندا بەشداریی کردوە کەلەنێوان چەند تیرەیەکی موشریکدا بەستراون پێش پێغەمبەرایەتی، بەس ئێمە بۆچی باسیان دەکەین؟ چونکە دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ مەدحی ئەو دوو پەیمانەی کردووەو فەرمووشیەتی: ئەگەر لە ئیسلامیشدا بانگ بکرێم بۆ پەیمانی ئاوا، تێیدا بەشدار دەبم، یەکێك لەو دووپەیمانە پێی دەوترێ: پەیمانی جوامێران (حلف الفضول)، ئەوی دیش پێی دەوترێ: پەیمانی بۆن خۆشکەران (حِلْف المُطَيِّبين)، جا هەرچی (حلف الفضول)ە، لە ئەنجامی ئەوەدا بووە کە کابرایەك دێ شتێك دەفرۆشێ لە مەککەو یەکێك لە سەرۆك تیرە دەسەڵاتدارەکانی مەککە شتەکەی لێدەستێنێ، کە هەندێك دەڵێن کەلوپەلێك دەبێ و پارەکەی ناداتێ، هەندێك دەڵێن کچێکی لێ زەوت دەکات، کابراش دەچێتە سەر یەکێك لە کێوەکانی مەککەو، هاوار دەکات، دەڵێ: ئەی خەڵکی مەککە! ئەی جوامێرانی مەککە وەرن دیفاعم لێ بکەن، ئەو کابرایە ئەو زوڵمەی لێ‌کردووم، ئیدی پێنج تیرە دەچن دیفاع دەکەن لەو کابرایە، کە وەکو ئیبنوهیشام هێناویەتی[1]: (بنو هاشم، بنو

1) هەمان سەرچاوە، ج1، ص72.

المطلب، أسد بن عبدالعُزّى، بنو زهرة، تيم بن مُرّة)، ئەو پێنج تیرەیە پەیمان پێکەوە دەبەستن کە لەمەودوا هەرکەسێ زوڵمی لێ کرا لە مەککە، دەبێ دیفاعی لێ بکەین، پێغەمبەر ﷺ بەو موناسەبەتەوە فەرموویەتی: **((لقد شهدتُ في دار عبدالله بن جدعان حِلْفاً ما أَحِبُّ أن لي به حُمُرَ النِّعم، ولو أُدْعى به في الإسلام لأجبت))**، کە (ابن اسحاق) هێناویەتی، واتە: لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی جیدعاندا بەشداریی پەیمانێك بووم، حەز ناکەم کە ئەو پەیمانە بشکێنمو حوشتری سپیم هەبێ (دیارە حوشتری سپی ماڵێکی بەقیمەت بووە)، وە ئەگەر لە ئیسلامیشدا بانگ بکرێم بۆ پەیمانێکی ئاوا وەڵام دەدەمەوە، ئەمە (حلف الفضول) کە کۆمەڵە پیاوێکی جوامێر پەیمان دەبەستن کە لەمەودوا نەیەڵن کەس زوڵمی لێ بکرێ، هەروەها (حلف المُطَيِّبين)یش بووە کە ئەویش دیسان پێغەمبەر ﷺ تێیدا بەشدار بووەو لەوبارەیەوە دەفەرموێ: **((شَهِدتُ حِلْفَ المُطَيِّبين وما أحِبُّ أن أنْكُثَهُ وأن لي به حُمُرَ النِّعم))**، رواه أحمد، واتە: بەشداریی پەیمانی موتەییەبین بووم، حەز ناکەم هەڵی بوەشێنمەوەو حوشتری سپیم بدەنێ لە بەرانبەرییدا، پوختەی چۆنیەتی ئەو پەیمانەش ئەوەبووە کە هەردووك تیرەی: (بنو عبدالمناف)و (بنو عبدالدار) لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی کاروباری ئیداریی نێو شاری مەککە کێشەو مشتومڕیان دەبێو سەرەنجام هەرچوار تیرەی: (بنو أسد بن عبدالعُزّى)و (بنو زهرة بن كلاب)و (بنو تيم بن مرة بن كعب)و (بنو الحارث بن فهر بن مالك بن النَّضر) دەدەنە پاڵ (بنو عبد مناف)و دەفرێکی پڕ لە میسك دێننو لەلای کەعبە هەموویان

دەستی تێدەخەن‌و دەستیان لەدیواری کەعبە هەڵدەسوون، وەك جەختکردنەوە لەسەر پشتی یەکدی گرتن، بۆیە نازناوی: بۆن خۆشکەران (المُطيِّبين) وەردەگرن.

وە لەبەرانبەریشدا هەرچوار تیرەی: (بنو مخزوم)و (بنو سهم)و (بنو جُمَح)و (بنو عدي) دەدەنە پاڵ (بنو عبدالدار)و ئەمانیش بەهەمان شێوە پەیمانی بەرگریی لەیەکدی کردن پێکەوە دەبەستن‌و، ئەمانیش نازناوی: هاوپەیمانەکان (الأحلاف) وەردەگرن.

جا دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ بۆن خۆشکراوان (مُطيِّبين)دا بووە، بۆیە فەرموویەتی: (شهِدْتُ حِلْفَ المطيَّبيين..).

جا پێغەمبەر ﷺ دیسان مەدحی پەیمانی موتەیيبين دەکاو دەفەرموێ: من شانازیی پێوە دەکەم کە تێیدا بەشدار بووم، ئێستاش ئامادە نیم هەڵی بوەشێنمەوە، مێژوونووسان دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ئازادکرانی مەککەدا عوسمانی کوڕی تەڵحەی بانگ کرد کە لەو تیرانەیە کاتی خۆی کلیل بەدەستی کەعبە بوون، فەرمووی: (وەك پابەندیی بە پەیمانەکەی کە کاتی خۆی لە نێوان موتەیيبين‌و ئەحلافدا هەبووە) (هاك مفتاحك يا عثمان، اليوم يوم برّ وَوَفاء)[1]، واتە: ها ئەی عوسمان کلیلەکەت بگرە! ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەکاریی‌و وەفادارییە.

مێژوونووسان دەڵێن: ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەر ﷺ وەفاداریی بووە بەو پەیمانە کە پەیمانی موتەیيبينە لەگەڵ ئەحلافدا کە

1) السيرة النبوية لابن هشام، ج4، ص234.

نێوەڕۆکەکەی ئەوە بووە، کەس زوڵم لە کەس نەکات‌و ئەرك‌و مافەکان دابەش بکرێن لە نێوان پێکهاتەکانی شاری مەککەدا.

+ زۆر سوپاس کە ژمارەیەك بەڵگەت لەوبارەیەوە باسکرد، من پرسیارێکم هەیە و بەراوردێکیشم هەیە لەنێوان ئەو بەڵگانەی بەڕێزت باستکردن لەگەڵ ئەو هاوپەیمانێتییەی کە ئێوە هەتانە بۆ هەڵبژاردنەکان.

– فەرموو:

+ ئەو کەسانەی کە تێبینییان هەیەو پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی بەڕێزتانیان هەیە، پێیان وایە هاوپەیمانێتیی بۆ هەڵبژاردن جیاوازە، چونکە هەڵبژاردن وەکو هیچ پرۆسەیەکی تر نیە، بۆ پەرلەمانە، پەرلەمانیش ئەنجوومەنێکی تەشریعییەو یاسا بۆ خەڵکی وڵات دەردەکا، ئنجا دەنگدانیش پرۆسەی شایەتییدانەو ناکرێ ئینسانی مسوڵمان شایەتیی بۆ لیستێك بدات کە کەسێکی تیابێ نامسوڵمان بێ، یان عەلمانیی بێ، یان ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەکو ئایین تەبەننی نەکا، ئەوە سەرنجێکە.

ـ من پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە یاخود ئەو ئیشکالە ڕوون بکەمەوە، دەمەوێ بەڵگەیەکی دیکەی شەشەم بخەمە پاڵ ئەو بەڵگانەی پێشوو، ئەویش ئەوەیە کە خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (المائـدة) لە ئایەتی ژمارە (2)دا کە لە بەرنامەیەکی پێشووتریشدا ئەو ئایەتەم هێنا، خوا خیتاب لەگەڵ مسوڵماناندا دەکا، دەیاندوێنێ‌و دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ

فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾ المائدة﴾، لەم ئایەتە بەپێزەدا خوا (سبحانە وتعالی) فەرمان بە مسوڵمانان دەكات كە دروشمەكانی خوا نەشكێنن، واتە: ئەو دروشمانەی كە قەدەغەی كردوون بۆ خۆیانیان حەڵاڵ نەكەن، خەڵكانێك كە ڕێز لە دروشمەكانی خوا دەگرن، ئەوان لەسۆنگەی ئەوەوە كە بە نامسوڵمانیان دەزانن، نەچن تەجاوز بكەنە سەریان، دوایی لەو سیاقەی ئایەتەكەدا دەفەرموێت: ﴿... وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ ...﴾، وە هاوكاریی یەكدیی بكەن (واتە: لەگەڵ غەیری خۆتان)دا لەسەر چاكەكاریی‌و پارێزكاریی، بەڵام هاوكاریی یەكدیی مەكەن لەسەر گوناح‌و دەستدرێژیی، كەواتە: لەم ڕستە قورئانییە وەردەگیرێ كە تۆ بۆ هەر مەبەست‌و ئامانجێكی شەرعیی، كە لەنێوان تۆو تەرەفی بەرانبەردا هەیە، مادام ئەو ئامانجە لە خودی خۆدا ئامانجێكی شەرعیی‌و شتێكی باش‌و بەكەڵك بێ، تۆ نەك هەر بۆت هەیە، بەڵكو لەسەرت پێویستە هاوكاریی بكەی‌و دەستبار بگری بۆ ئەو تەرەفەی بەرانبەرت، چونكە خوا فەرمانی بەوە پێ كردووی، (البِرّ)یش واتە: چاكەكاریی، هەر شتێك كە بۆ خەڵك باش بێ‌و سوودو بەرژەوەندیی خەڵكیی تێدا بێ، (التقوى)ش یانی: پارێزكاریی، واتە: هەرشتێك مایەی پارێزران لەسزاو تووڕەیی خواو مایەی ڕەزامەندیی خوا بێ، بەڵام ئەوەی كە لەسەر

ئینسان قەدەغە کراوە، ئەوەیە کە لەسەر گوناح و دەستدرێژیی دەستبار بۆ خەڵك بگرێ و هاوکاریی خەڵك بکا، کەواتە: ئێمە لەگەڵ ئەو دوو لایەنەو هەر لایەنێکی دیکەشدا، چونکە ئێمە کە لەگەڵ ئەو دوو لایەنەدا لیستمان پێکهێناوە، مانای وانیە کە خۆمان لە لایەنەکانی دیکەش دابڕیوە، چونکە ئێمە لەگەڵ هەموو ئەو لایەنە سیاسییانەی دیکەدا پێکەوە لەم وڵاتەداین و هەموومان کار دەکەین بۆ ئەوە کە خەڵکەکەمان بەختەوەر بکەین و وڵاتەکەمان ئاوەدانبێ و خێروخۆشیی بۆ خەڵك دابین بکەین و دادگەریی بچەسپێنین، هەموومان ئەگەر بە کردەوەش پراکتیزەی نەکەین، بە لایەنی کەمەوە ئەو دروشمانەمان بەرز کردۆتەوە، کەواتە ئێمە لە ڕووی شەرعییەوە مولزەمین کە بۆ هێنانەدی ئامانجە هاوبەشەکان لەگەڵ هەموو کەسدا هاوکارو دەستبارگربین، با ئیتیفاقیەی ئیمزاکراویشمان نەبێ، بەڵام کە ئیتیفاقیەی ئیمزاکراو هەبوو ئەوە زیاتر مولزەم دەبێ، جارێك بە حوکمی دەقەکانی شەریعەت و جارێکیش بە حوکمی ئەو بەڵێن و پەیمانەی کە داوتە.

سەبارەت بە پرسیارەکەشت یان ئەو ئیشکالە کە هەندێك کەس باسی دەکات کە هەڵبژاردنی نوێنەران بۆ پەرلەمانە، پەرلەمانییش شوێنی بڕیاردان و یاسادانانە، هەر بەکورتی دەڵێین: بنچینەیەکی شەرعیی هەیە کە خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتداو پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتدا ڕوونی کردۆتەوە کە حیساب و کیتاب لەگەڵ ئینساندا دەکرێ بەپێی نیازو مەبەستی: وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ...۝٥﴾ البينة، واتە: وە تەنیا فەرمانیان بەوە پێکرابوو کە بەندایەتی بۆ خوا بکەن و ملکەچیی

خۆیانی بۆ ساغ بکەنەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: **((إنما الأعمال بالنيات ...))** متفق عليه، واتە: بێگومان کردەوەکان بەس بەپێی نیاز (نية)ەکانن، کەواتە: ئەسڵ لە هەر کارێکدا ئەوەیە کە تۆ مەبەستت پێ لەو کارە چییە؟! کەسێك کە دەنگ دەدات با بەو نییەتە دەنگ بدات کە نوێنەرێکی باشی لەو ئەنجوومەنی یاسادانانو پەرلەمانەدا هەبێ، وە با نییەتی وابێ کە ئەو خەڵکانەی ئەو بە باشیان دەزانێ، کە داکۆکیی دەکەن لەو ئامانجانە کە ئەو بە ڕێكو ڕاستو شەرعییان دەزانێ، بچنە پەرلەمانەوە، وە با نییەتی وانەبێ کە کەسێکی نائیسلامیی یان نامسوڵمان بچێتە پەرلەمان، ئەوکاتە بەرهەمو پاداشتی کارەکەی بەپێی نییەتەکەی خۆیەتی، پاشان لێرەدا مەسەلەیەکی دیکەش هەیە: هەندێك کەس وادەزانێ پەرلەمانتاران هەر لەگەڵ زمانیان هەڵهێنا ئەوە حەتمەن یان شتێك حەرام دەکەن، یان شتێك حەلاڵ دەکەن، کە بێگومان ئەوەش وانیەو ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە هۆیەکەی شارەزا نەبوونە لە ئەرکی پەرلەمان، چونکە پەرلەمان سێ ئەرکی سەرەکیی هەن، یەکەم: یاسادانانە، دووەم: پێکهێنانی حکوومەتو چاودێریی حکوومەتو چاودێرییکردنی وەزیرەکانەو لێپرسینەوەیانەو ئاراستەکردنو تەوجیهکردنیانە، سێیەم: موسادەقەکردنە لەسەر بودجەو ئاگاداربوونە لە دارایی، چەند واریدات دێو چۆن خەرج دەکرێ؟! ئەمانە سێ ئەرکە سەرەکییەکەی پەرلەمانن، کەواتە: تەنیا یەکێك لە ئەرکەکانی پەرلەمان یاسادانانەو یاسادانانیش هەمووی هەر مەسەلەی حەرامو حەلاڵ نیە، بەڵکو زۆری شتی ئیدارییەو چەند مەسەلەیەکە کە مەرج نیە لەگەڵ شەرعدا تێك بگیرێن.

+ دووانیان هەر پەیوەندیی یان بە عەقیدەوە نیە: لێپرسینەوەی حکوومەتو تەسدیقی بودجە.

ـ بەڵێ ئەركی پەرلەمان زیاتر پەیوەندیی بە كاروباری ئیدارییەوە هەیە، سوودو بەرژەوەندیی خەڵك چۆن تەحقیق دەبێ؟ چۆن زیانو زەرەریان لێ دوور دەخەیەوە؟ كە ئەوە بۆ خۆی لە ئەسڵدا فەرزێكی شەرعییە، پاشان زۆر جاران خەڵكی ئیسلامیی‌و غەیرە ئیسلامیی هەموومان لەسەر هێندیك بەها یەكدەنگین، هەمووومان لەسەر دادگەریی یەكدەنگین، وە لەسەر نەبوونی گەندڵیی هەمووومان یەكدەنگین، وە لەسەر نەبوونی مەحسوبییەت، دەیناسیۆ ناینایسیۆ خزمیەتی یان بێگانەیە هەمووومان یەكدەنگین، زۆر بەهای بەرزو باش هەن هەمووومان لەسەریان یەكدەنگین، دەمێنێتەوە ئەو شتانەی كە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامییدا دژن‌و تێكدەگیرێن، ئێمە دیارە وەك لایەنێكی ئیسلامیی خۆمان بە موكەللەف دەبینین‌و بە ئەركی سەرشانی خۆمانی دەزانین كە بەرگریی بكەین لەیاساو سنوورەكانی شەریعەت‌و هەر شتێك كە دژی شەریعەتی ئیسلامیی بێ، بەپێی توانای خۆمان، پێشگیرییان لێ بكەین‌و نەیانهێڵین، كە دیارە هەندێك لەو شتانەش جاری وا هەیە یەكێكی دیكەش بە پاڵنەرێكی دیكەو هاندەرێكی دیكە هەر ڕەفزی دەكات‌و دژیەتی‌و بە زیانی خۆی دەزانێ، بۆ وێنە: ئایا ڕەواجپێدانی ئیباحییەت (بەرەڵڵایی جنسیی) وەكو چۆن پێچەوانەی دەقەكانی قورئان‌و سوننەتە، ئایا پێچەوانەی هێمنیی‌و ئاسایشی خەڵكییش نیە؟ وە پێچەوانەی ڕەوشت‌و ئەخلاقی بەرز نیەو پێچەوانەی بەرژەوەندیی كۆمەڵگاش نیە؟ بێگومان با، چونكە ئەو شتانە كە شەریعەت قەدەغەی كردوون، بە

تەئكید لەبەر ئەوەیە كە زەرەرو زیانی زۆریان لێدەكەوێتەوە بۆ تاك‌و كۆمەڵ‌و خێزان، لە ڕووی سیاسیی‌و كۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و ئەخلاقیی‌و... هتدەوە، كەواتە: نابێ هەر لە ڕێوە پێمان وابێ كە هەر شتێك لەگەڵ شەریعەت تێكدەگیرێ، هەر خۆمان دەبین، لە بەرانبەریدا وەك بەكردەوە دەریش كەوت لە مەسەلەی یاسای (باری كەسێتیی)دا، كە زۆر كەس ویستیان یاساكە بە بارێكدا بخەن، بەڵام بۆیان نەچۆسەر، هەرچەندە بێگومان ئێستاش هەڵەو ناشەرعیی هەر تێدان، بەڵێ: خەڵكی دیكەش كەم‌و زۆر خۆی بە مسوڵمان دەزانێ‌و دیفاع لە ئیسلام دەكا، بۆیە ئێمە نابێ ڕەشبین بین، دەمێنێتەوە ئەوە بڵێین: بەڕاستیی ئێمە كە لەگەڵ ئەو دوو لایەنە سیاسییەدا هاوپەیمانێتیمان بۆ هەڵبژاردنەكان بڕیارداوە، ئێمە شتی فراوانمان هێناوەتە بەرچاوی خۆمان، بۆ وێنە: لابردن‌و نەهێشتنی گەندەڵیی، چەسپاندنی دادگەریی، دابینكردنی ماف‌و ئازادییەكان بۆ خەڵك، ئاوەدانكردنەوەی كوردستان، دابینكردنی پێداویستییەكانی ژیانی خەڵك، دروستكردنی ژێرخانی ئابووریی، دەربازكردنی هەرێمی كوردستان لەو قەیرانە نێوخۆیی‌و دەرەكییانەی تێیان كەوتوە، ئێمە ئەوانەمان هێناوەتە بەرچاوی خۆمان، ئنجا پێغەمبەریش ﷺ وەختێ كە لەگەڵ خەڵكی دیكەی غەیری خۆیدا پەیمانی بەستوە، خۆ بە تەئكید لەسەر ئەوە نەبووە كە هەموویان پێكەوە نوێژ بكەن، وە لەسەر ئەوە نەبووە كە هیچیان شەڕاب نەخۆنەوە، كابرای جوولەكە گۆشتی بەراز دەخواو شەڕاب دەخواتەوەو قومار دەكات، وە كابرای (خوزاعە)یی بت دەپەرستێ‌و هەموو ئەو شتانەی كە ئیسلام بە حەڕامیان دەزانێ ئەو بە حەڵاڵیان دەزانێ ، ئەدی لەسەر چی

بووە؟ دیارە بەرژەوەندییەکی هاوبەش هەبووە، کە بریتی بووە لە: دیفاع لە یەکدیی کردنو شەڕ لەسەر یەکدیی کردن، کە ئەوە بەرژەوەندییەك بووە بۆ هەردووکیان باش بووە، لەو حاڵەتانەدا دەبێ تەماشای چی بکەی؟ دیارە دەبێ سەرنج بدەی چ شتێك بۆ تۆش و ئەویش باشە؟ کە من دەتوانم بڵێم سەدان شت هەیە بۆ ئێمە وەکو ئەو خەڵکێکی ئیسلامیی باشە، وە بۆ ئەو دوو لایەنەو لایەنەکانی دیکەش باشە، کە ئێمە دەتوانین هەموو ئەوانە بکەینە خاڵی هاوبەشو ئامانجی هاوبەشو دەستباری یەکتر بگرینو هاوکاریی یەکدیی بکەین بۆ تەحقیقکردنیان.

+ مامۆستا! لە کۆتایی بەرنامەکەمان نزیك بووینەتەوە، بەڵام قسەی کۆتاییت چیە بۆ ئەو کەسانەی بە پێچەوانەوە ویڕای ئەوەی کە بەڵگەکانیش ئەبینن، بەڵام ئەوان هەر ئینکاریی و پێداگریی دەکەن لەسەر ئەوەی کە ئەمە مەسەلەی عەقیدەو خواو پێغەمبەری خوا ﷺو قورئانەو، عەقیدەی ئیسلامیی لەگەڵ هیچ عەقیدەو بیروباوەڕێکی تر یەك ناگرێتەوە، ئەوەش مەسەلەی تەشریعە، واتە: زۆربەی کاتیش بە قووڵیی ناچنە ناو دەقەکانەوە، زۆر بە سادەو ساکار تێیدەگەن یان کوردێکی مسوڵمانە لێرە لە شارەکان بە فەتوای مامۆستایەك یان زانایەکی خەلیج یان وڵاتێکی تر باوەڕ دەکات، بە کورتی قسەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە چییە؟

- بە کورتیی قسەم ئەوەیە هەموو ئەوانەی ئاوا بیردەکەنەوە، من پێموایە بەڕاستیی لە ئیسلام تێنەگەیشتوونو کەسانێکی سەرکێڵو سەتحییەو ئەزموونی نێو کاری ئیسلامیی و بانگەوازی ئیسلامیی و چاکسازیی و پاکسازیی کۆمەڵگایان نیە، ئەگەرنا وەرە لە زانایانی هاوچەرخ، هەر

له (حسن البنّا)و (مودودي)يەوه بگره، هەتا (شيخ ناصرالدين الألباني)و (شيخ ابن باز)و (شيخ عثيمين)و (شيخ يوسف القرضاوي)و (شيخ محمد أبو زهرة)و...هتد، ئەو زانایانه هەموویان (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ) ئەوانەی كه ماون و ئەوەی كه وەفاتیان كردوه، هەموویان لەسەر بەشداریی كردن له هەڵبژاردنو پەرلەماندا، پاشان هاوپەیمانیی دروستكردن لەگەڵ غەیردا، واته لەگەڵ لایەنه سیاسییەكانی دیكەدا به جیاوازیی ئیدۆلۆژییەكانیشەوه، هەموولا یەكدەنگن لەسەر ئەوه، تەنیا چییان به مەرج گرتوه؟ گوتوویانه: گرنگ ئەوەیه بەرژەوەندیی مسوڵمانان دابین بكرێ، واته: سوودو قازانجەكان دەستەبەر بكرێنو زەرەرو زیان دوور بخرێنەوه، ئنجا ئەو كەسەش كه دەڵێ عەقیدەی ئیسلامیی جیایه له هەموو عەقیدەكان، ئێمه پێش ئەو وا دەڵێین، خۆت ئاگاداری من كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)م هەیه شەش بەرگه، دوو سێ هەزار لاپەڕەیه، ئەگەر ئەو به كورتی وا دەڵێ، ئێمه به درێژیی وامان گوتوەو ڕوونمان كردۆتەوه، بەڵام ئایا عەقیدەی ئیسلامیی جیابوون له عەقیدەكانی دیكه، مانای وایه كه مسوڵمان سەلام له خەڵك نەكاو نەگونجێ لەگەڵ خەڵكی دیكەدا بژیو هاوكارو دەستبارگر بێ؟ خۆ ئەمه ئەگەر بۆ سۆشیالیستو زەحمەتكێشان له ئارادا بێ، دەبووایه بۆ پارتیو یەكێتیی پێشتر باسی بكەن، چونكه ئێمه له ئەنجوومەنی باڵای پارته سیاسییەكانیشدا ئەندام بووین، كه ئێستا نازانم نه ماوین، نه نەماوین؟ پاشان لەگەڵ یەكێتیو پارتییدا كاتی خۆی، پێشتر یەكگرتووی ئیسلامیی لەگەڵ لیستی هاوپەیمانی كوردستان (پارتیو یەكێتی) بوو، كۆمەڵی ئیسلامیی لیستی

سەربەخۆی هەبوو، کە ئەوکاتە من لە زیندان بووم، دوایی لە هەڵبژاردنەکانی دواییدا ئێمە کەوتینە لیستی هاوپەیمانی کوردستان، چونکە بارودۆخەکە وابوو کە ئێمە نەمانتوانی لیستێکی ئیسلامیی پێکبێنین‌و سەرەنجام ئێمە کەوتینە گەڵ لیستی هاوپەیمانی کوردستان، جا خۆ لەبەرئەوە کە سۆشیالیست‌و زەحمەتکێشان کەمن، یان گچکەترن لە پارتی‌و یەکێتیی، نابێ بڵێی: ئەگەر لەگەڵ حیزبی گچکە بیکەی حەڕامە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ هی گەورە بیکەی حەڵاڵە، ئەگەر حەڕام بێ لەگەڵ هەمووان حەڕامەو ئەگەر حەڵاڵ بێ لەگەڵ هەمووان حەڵاڵە، ئنجا لە حەقیقەتیشدا ئەو قەزیانە بناغەو ئەسڵ تێیاندا حەڵاڵیی‌و حەڕامیی نیە، بەڵکو ئەسڵ ئەوەیە چۆن بەرژەوەندیی تەحقیق دەبێ؟! ئەگەرنا ئەسڵ لە هەڵسوکەوتەکاندا دەستکراوەییە، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ (خذاعة) هاوپەیمانێتی جەنگ‌و ئاشتی کردوە، لەگەڵ (بني ضمرة)دا کە تیرەیەکی موشریك بوون، ڕێککەوتنی موادەعەی کردوە واتە شەڕمان مەکەن‌و شەڕتان ناکەین[1]، وە پێغەمبەر ﷺ ئامادە بووە هۆزی (غطفان) لە شەڕی خەندەقدا یەك لەسەر سێی بەروبوومی مەدینەیان بداتێ[2]، بەس لەکۆڵی ببنەوەو شەڕی لەگەڵدا نەکەن، ئامادەبوو ڕێکەوتنێکیان لەگەڵ بکات، پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادە (کە سەرۆکی ئەوس‌و خەزرەج بوون) بانگکردن‌و ڕاوێژی پێکردن‌و فەرمووی: دەڵێن چی؟ (ڕێککەوتنەکەیان تەواو کردبوو و کەوتبوونە سەر ئیمزاکردن) ئەوە من بە تەمای

---

1) السيرة النبوية لابن هشام، ج2، ص318.
2) هەمان سەرچاوە، ج3، ص(109-108).

ڕێککەوتنێکی ئاوام، کە سێیەکی بەروبوومی مەدینە (کە شارێکی کشتوکاڵیی بووەو دارخورمای زۆرو کشتوکاڵ و میوەجاتی زۆری بووە) بدەم بەو دوو تیرە موشریکانە بۆئەوەی لەکۆڵمان بنەوە کە ئابلۆوقەی مەدینەیان داوە، بەڵام هەردوو سەعد (خوا لێیان ڕازیی بێ) گوتیان: ئەوانە لە سەردەمێکدا کە ئێمە کافرو موشریك بووین پێش ئەوەی خوا هیدایەتمان بدات تەماعیان نەبووە لە ماڵ و میوەی ئێمەدا بەبێ پارە، بە کڕین نەبێ، ئێستا کە خوای پەروەردگار ئێمەی بەهۆی تۆوەو بەهۆی ئیسلامەوە عیززەتمەند کردوە "والله لا نعطيهم الا السيف"[1]، بەخوا جگە لە شمشێر شتێکی دیکەیان نادەینێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **((رأيت العرب قد رمتكم عن قوس واحدة))**، تەماشام کرد عەرەبی کافر هەموویان لە یەك کەوانەوە تیرتان تێدەگرن، واتە هەموویان لەسەرتان کۆبوونەوە، وتم دوژمنێکتان لێ کەمبکەمەوە، ئەگەر بۆ خۆتان ڕازیی نین و لە خۆتان ڕادەبینن، نایکەین، ئیدی ئیتیفاقییەکەیان هەڵوەشاندەوە، کەواتە: مەسەلەی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکدا، لەگەڵ لایەنە سیاسییەکاندا دەمێنێتەوە ئەوەی کە چۆن بەرژەوەندیی مسوڵمانان زیاتر تەحقیق دەبێ، واتە: چۆن زیانیان زیاتر لێ دوور دەخرێتەوەو سوودی زیاتریان پێدەگەیەنرێ، ئا ئەوە سەنگی مەحەکە لە بواری سیاسەتی شەرعییدا، ئەگەرنا ئەوەی کە دەڵێ: ئاخر لە پەرلەماندا شتی هەڵەو ناهەق دەگوترێ، دەڵێین: مرۆڤ ئەگەر لە ماڵی خۆشیدابێ و ڕازیی بێ بە یاسایەکی پەرلەمان، بە بڕیارێکی پەرلەمان

1) هەمان سەرچاوە، ج3، ص109.

کە لەگەڵ دەقێکی قورئان‌و سوننەت تێك دەگیرێ، ئەوە هەر لە ماڵێ کافر دەبێ‌و پێویست ناکات بچێ لە پەرلەمان کافر بێ، بەلاّم با لە نێوجەرگەی پەرلەمانیشدا بێ، ئەگەر ڕازیی نەبێ بە ناشەرعیی، نەك هەر پێی کافر نەبووە، بەڵکو وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر))** رواه أبو داود، واتە: باشترین جیهاد بریتییە لە قسەیەکی حەق لای دەسەلاّتدارێکی ستەمکار، کە ناشەرعیی دەکا، بەڵێ تۆ لەوێ بڵێی: نەخێر، ئەوە بەڕاستیی گەورەترین جیهادەو هیچ گوناهباریی تێدا نیە، بەڵکو ئەوە گوناهبارییە کە تۆ لێگەڕێی ئەو پەرلەمانە خەڵکی دیکە بچێ‌و ناشەرعیی تێدا بڕیار بداو تۆش بێ‌دەنگ بی، یاخود لە ماڵی خۆت پرتەو بۆڵە بکەی، نەخێر، بچۆ لەوێ قسەی حەقی خۆت بکە، ئیسلام ئاوای گوتوە، بچۆ لەوێ قسەی حەقی خۆت بکەو دیفاع لە حەقەکەی خۆت بکە، چونکە تۆ نوێنەری خەڵکی مسوڵمانی، ئەمما تۆ کە لە ماڵی خۆت پرتەو بۆڵە دەکەی‌و ڕەخنە دەگری، ئەوە بە فلسێك ناچێ، ئنجا لە ڕاستییدا ئەوانە کە ئاوا بە ڕەهایی ڕەخنە لەو جۆرە کارانە دەگرن، هەر ڕەخنە لە ئێمە ناگرن، بەڵکو ڕەخنە لە حەسەن بەنناو ئەبوولئەعلای مەودودیی‌و ئیبن بازو ناصرەددینی ئەلبانی‌و... هتد (ڕەحمەتی خوایان لێبێ) دەگرن، وە من هیچ زاناو شارەزایەکم پێ شك نایە ڕێی کاری سیاسی، بە (هاوپەیمانێتی)یشەوە، لە مسوڵمانان گرتبێ، بەڵکو هەموویان گوتوویانە دەبێ تەماشا بکەی: ئەگەر مەسڵەحەتی ئیسلام‌و مسوڵمانان بەوە تەحقیق دەبێ، با بکرێ‌و ئەگەر زیانی تێدایە با نەکرێ، دەجا منیش هەر ئەمە دەڵێم‌و ئەگەر زیانی

تێدابێ نابێ بیکەی، بەڵام ئەگەر بزانی بەرژەوەندیی بەوە نەبێ تەحقیق نابێ، کۆمەڵێك مەفسەدەو خراپە هەیە بەوە نەبێت لە کۆڵت نابێتەوە، ئەوە لەڕاستییدا لەوکاتەدا نەك هەر بۆت ڕەوایە، بەڵکو جاری وایە لەسەریشت پێویست دەبێ، بەپێی بنچینەی شەرعیی: (ما لایتم الواجب الاّ به فهو واجبٌ) واتە: هەرشتێك فەرزێك پەکی لەسەری کەوت، فەرز دەبێ.

# ڕێ خۆشكردن

الحمدلله رب العالمين، وصلى الله تعالى وسلم على محمد وآله المهتدين بهديه المبين.

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بابەتەی بەردەستت لێكۆڵینەوەیەكە لەبارەی ڕەوایی‌و ناڕەوایی بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن‌و پەرلەماندا (واتە: پەرلەمانێك كە دەگونجێ بڕیارو یاسای ناشەرعیی تێدا دەربكرێن) لە دوو ئاڵقەی بەرنامەی (سەرنج)ی كەناڵی ئاسمانیی (پەیام)دا پێشكەشكراون، لەسەر شێوەی وتووێژو پرسیارو وەڵام لەنێوان بەڕێز كاك (عمر عبدالله گوڵپی)و بەندەداو، پاش هێنرانە سەر كاغەزیان‌و[1] پێداچوونەوەو چاوپێداگێڕانەوەی خۆم، بەم شێوەیەی ئێستای لێهاتوە.

هیواداریشم خوای بەزەیی بێسنوور -سبحانه وتعالى- بیگێڕێ بەمایەی زیاتر بەرچاو ڕوونبوونەوەی خوشك‌و برایانی مسوڵمانان‌و لاچوونی هەرجۆرە تەم‌ومژو ئیشكالێك كە لەوبارەوە هەیانبووبێ.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألاّ إله إلاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك

15ی ڕەجەبی 1430

8ی تەمووزی 2009 - هەولێر

---

1) لەلایەن چەند برایەكی كەناڵی ئاسمانیی (پەیام)ەوە، خوا پاداشتیان بداتەوەو وێنەیان زۆر بكات.

**بەندی یەکەم: ئالقـەی یەکەم**

## بەڵگەکانی ئەوانەی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردنو پەرلەماندا بەناڕەوا دەزانـنو بەرپەرچدانەوەیان

# دەستپێك

بەڕێزان!

لەم ئاڵقەیەی بەرنامەکەماندا باس لە ڕەوایی‌و ناڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن‌و پەرلەماندا دەکەین، بە تایبەت کە لەم کاتانەدا قسەوباس لەسەر ڕەوایەتی‌و ناڕەوایەتی بەشدارییکردنی هەڵبژاردنەکان‌و پەرلەماندا، لەلایەن هەندێك لەو کەسانەوە دروست دەبێ کە لە چوارچێوەی ئیسلامییەکاندا بیروبۆچوونی جیاوازیان هەیە.

+ بەڕێز مامۆستا! وەك دیارە لەم کاتانەدا بیروبۆچوونێك هەیە کە لە چوارچێوەی پرسیار لەسەر ڕەوایەتی هەڵبژاردن‌و بەشدارییکردن لە پەرلەماندا خۆی دەبینێتەوە، لێرەدا دوو بۆچوونی سەرەکیی هەن، بۆچوونێك پێی وایە بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن‌و پەرلەماندا ناڕەوایە، خاوەنی ئەم بۆچوونەش هێندێك ئایەت‌و فەرموودەو قسەی زانایانیش بە بەڵگە دەهێنێتەوە، وە لەلایەکی ترەوە بۆچوونێکی دیکەشمان هەیە کە بە پێچەوانەوە، پێی وایە بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن‌و پەرلەماندا نەك گرفتێك نیە، بەڵکو هێندێك جار بە واجبیشی دەزانن، بەڵگەشیان لە قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ‌و بۆچوونی زانایانی هاوچەرخ هەیە، ئێمە لەم ئاڵقەیەدا پشت بە خوا پرسیارەکانمان لەو چوارچێوەیەدا دەخولێنەوە، جا بەڕێز مامۆستا! سوپاست دەکەین کە دەرفەتمان ئەدەی‌و ئەمجارە تەشریفت هێنا بۆ ستۆدیۆی دووەمی بەرنامەی سەرنج.

ـ بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه، منيش خۆشحاڵم بە دیدارتانو لە خزمەتدام.

+ سەرەتا لە پێناسەی هەڵبژاردنو پەرلەمانەوە دەستپێدەكەین، پاشان دێینە سەر تەوەرەكان، بەڕێزت وەك بیریارو نووسەرو ڕۆشنبیرێكی ئیسلامیی، چۆن پێناسەی ئەم دوو چەمكە دەكەی، مەبەستم هەریەكە لە هەڵبژاردنو پەرلەمانە بەشێوەیەكی گشتی؟

ـ من بە باشی دەزانم بەرلەوەی پێناسەی هەڵبژاردنو پەرلەمان بكەین، دوو سێ ڕوونكردنەوەی كورت عەرز بكەم بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی هەموو لایەك:

1- زانایانی پێشین ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ كەمو زۆر دەربارەی هەڵبژاردن بەو فۆڕمو شێوەیەی كە ئێستا هەیەو دەربارەی پەرلەمان قسەیان نەكردوە، چونكە واقیعێكی وەكو ئەوەی ئەمڕۆ ئەوكاتە لە ئارادا نەبووە، لەبەر ئەوە هەر كەسێك بۆ قسەی زانایانی پێشین بگەڕێ بۆ ڕەوایی یان ناڕەوایی بەشدارییكردن لە هەڵبژاردنو پەرلەماندا، شتێكی ڕاستی نەكردوە.

2- ڕوونكردنەوەی دووەم ئەوەیە كە بەشدارییكردن لە پەرلەماندا، كە ئایا دروستە یان نا؟! مەبەستیان پێی پەرلەمانێكە كە زۆرینەی خەڵكەكەی نامسوڵمان یان نائیسلامیی بێ، ئەگەرنا ئەنجوومەنێكی ڕاوێژ، یان پەرلەمان، یاخود ئەنجوومەنی نوێنەران، كە ئەمانە هەموویان ناون بۆ یەك نێوەڕۆك، واتە: ئەوانەی كە نوێنەری خەڵكن،

هەموو زانایان‌و شەرعزانانی هاوچەرخ‌و هی پێشینیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە مسوڵمانانی نێو هەر قەوارەیەکی ئیسلامیی، بەڵکو هەر کۆمەڵێکی ئیسلامیی، پێویستە نێوەندێکی بڕیاریان هەبێ‌و، نێوەندێکی یاسادانانیان هەبێ کە پێکهاتبێ لە کەسانێك کە خەڵك هەڵیان دەبژێرێ، ئەویش وەکو بەرجەستەکردنی ئایەتی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... ﴿٣٨﴾ الشورى﴾، واتە: کاروباری مسوڵمانان لەنێو خۆیاندا بە ڕاوێژە، جا ئەو ڕاوێژە دەگونجێ ڕاوێژی ڕاستەوخۆ بێ‌و هەموو خەڵك کۆبکرێتەوەو پرس‌و ڕاوێژیان پێبکرێ، وەکو لە یۆنانی قەدیمدا هەبووە، دەشگونجێ ڕاوێژپێکردنی ناڕاستەوخۆ بێ کە نوێنەرانیان کۆببنەوە لە ئەنجوومەنێکدا، کەواتە: پێویستە ئەوە بزانرێ ئەو مشتومڕەی هەیە لەنێو زانایانی هاوچەرخدا بۆ پەرلەمانێکە کە وەکو گوتم تێکەڵە.

+ عەلمانیی‌و ئیسلامیی؟

- بەڵێ، یان مسوڵمان‌و نامسوڵمان، وە دەگونجێ یاساو بڕیاری ناشەرعیی تێدا دەربکەین.

3- ڕوونکردنەوەیەکی دیکەشم ئەوەیە کە کاتی خۆی لە گەرمەی هەڵبژاردنەکانی ساڵی (1992)دا کە ئەوکاتە لەژێر ناوونیشانی (بزووتنەوەی ئیسلامیی)دا بووین، ئەوکاتیش ئێمە بەشداربووین‌و هیچ کام لەو هەل‌ومەرجانەی ئێستاش لە ئارادا نەبوون، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئێمە قەناعەتمان بەوە بووە کە بەشداریی ئەو پرۆسەیە بین، جا من ئەو کاتە کتێبێکم نووسی بە ناوی: (چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان‌و پەرلەماندا)، وە ئێستا هەندێك کەس

هەندێك قسەی ئەو کتێبە بە بەڵگە دێننەوە لەسەر ئەوەی کە ئێمە هەڵوێستی ئێستامان جیایە لە هی ئەوکاتە، هەڵبەتە ئینسان ئەگەر چاو بە هەندێ هەڵوێستو بیروبۆچوونی خۆیدا بگێڕێتەوە، هیچ خراپەیەکی تێدا نیە، بەڵکو ئازایەتی ئەوەیە کە ئەگەر ئینسان هەڵەیەکی کردبێ دانی پێدا بنێو ڕاستی بکاتەوە، بەلاّم بەڕاستیی ئەوەی کە لەوێدا گوتراوە، دەربارەی بەشدارییکردنمان لە هەڵبژاردنو پەرلەماندا، لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا دەیڵێین، جیاوازییەکی ڕیشەیی نیە، ڕەنگە لە هێندێك تەعبیرو شێوازی دەربڕیندا جیاوازیی هەبێ، بەلاّم جیاوازیی ڕیشەیی نیە، چونکە لەوێشدا گوتراوە: کە پەرلەمانێك یاسا دەربکات، یاسایەك کە پێچەوانەی شەریعەت بێ، واتە حەلاڵێك حەرام بکات، حەرامێك حەلاڵ بکات، ئەوە بەتەئکید بە شیركو کوفر لەقەڵەم دەدرێ، وە ئێستاش هەروا دەڵێین، بەلاّم ئایا مسوڵمانانێك کە بەشدار دەبن لە پەرلەمانێکی وادا بۆ ئەوەی ڕێگا بگرن لەو شیركو کوفرەو ڕێگا بگرن لەوەی حەلاڵێکی خوا حەرام بکرێ، یان حەرامێکی خوا حەلاڵ بکرێ، ئایا دروستە یان دروست نیە؟ دەڵێم: بێگومان نەك هەر دروستە، بەڵکو پێویستیشە، چونکە مەعقووڵ نیە لە نێوەندێکی بڕیاردانـدا بە ناوی میللەتێکی مسوڵمانەوە، حەلاڵو حەرامی خوا دەستکاریی بکرێو بگۆڕرێ، تۆش تەماشاچی بیو نەچی بەشداریی بکەیو ڕێی لێبگریو قسەی خۆت لەوێدا نەکەی!! وەکو گوتم لە ڕیشەو بنچینەی فیکرەکەدا، ئەوەی کە ئێستا دەیڵێین ئەوکاتەش هەر وامانگوتوە[1]، بەلاّم دیارە شێوازی

1) لەکۆتایی لێکۆڵینەوەدا لەوبارەوە گوتوومە: {کەواتە: ئەو مسوڵمانەی کە دەچێتە

تەعبیر لەگەڵ هی حەڤدە ساڵ پێش ئێستا دەگۆڕێ.

ئنجا بۆ سەلماندنی ڕەوایی هەڵبژاردنو بەشداریی لە پەرلەماندا، سەرەتا پێناسەی هەڵبژاردن دەکەینو هاوکات وەك بەڵگەی یەکەمیش دەڵێین:

1) هەڵبژاردن چ بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران بێ لەسەر ئاستی وڵاتێك وەکو عێراق، وە چ بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانێك یاخود ئەنجوومەنی نوێنەران بێ لەسەر ئاستی هەرێمێك، وە چ بۆ ئەنجوومەنی پارێزگا بێو، چ بۆ ڕێکخراوێکی پیشەیی بێ وەکو قوتابیان، ئەندازیاران، پزیشکان، مامۆستایان، هەموو ئەو هەڵبژاردنانە دەچنەوە نێو ئایەتی خوای پەروەردگارەوە کە دەفەرموێ: ﴿... وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ...﴾ الشورى ٣٨ کاروباری مسوڵمانان بە ڕاوێژە، واتە بۆ خۆیان ڕاوێژو مەشوەرەت دەکەنو سەرەنجام دەگەنە ئەوەی کە هەندێك کەس بکەنە نوێنەری خۆیان، کەواتە: لەپێناسەی هەڵبژاردنەوە بۆمان دەدەکەوێ کە نەك هەر شتێکی ڕەوا بگرە پێویستیشە، کەواتە: بەشداریی لە هەڵبژاردندا بۆ دیاریکردنی نوێنەرو مشوورخۆران ئەرکێکی شەرعییە، ئەوە بەڵگەی یەکەم.

---

پەرلەمانێکەوە تاکو لەوێدا ئەرکی بانگەوازکردنی خەڵکی بۆلای خوا، یان ئەرکی فەرمان بەچاکەو ڕێگرتن لەخراپە ئەنجام بدات، ئومێد وایە نەك هەر گوناهبار نەبێ، بەڵکو بەئەندازەی ئیخلاصو پەرێزی چاکیی خێرو پاداشتیشی بۆ بنووسرێ...}.

بڕوانە: (چارەسەری کێشەی کورد لەنێوان ئیمانو پەرلەماندا) لاپەڕە: 45، چاپی یەکەم: 1992.

2) پاشان هەموو دواندنەكانی قوڕئان بۆ كۆمەڵگای مسوڵمانی یەكەم بە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا...﴾ دەستپێدەكەن لە قۆناغی مەدەنییدا، واتە: لە قۆناغی مەدەنییدا كە قۆناغی دروستبوونی كیانو قەوارەیە، خوا (سبحانه وتعالى) بەگشتیی مسوڵمانانی بانگكردوە، كەواتە: مسوڵمانان بەگشتیی بەرپرسیارن بەرانبەر بە كۆمەڵگای خۆیانو بەرانبەر بە دینو ژینی كۆمەڵگەكەیانو پێویستە هەموویان لە خەمی ئیدارەكردنو بەڕێوەبردنی وڵاتدا بن، ئنجا دیارە ناشكرێ هەموویان سەرۆك، وە هەموویان وەزیر یان نوێنەر بن، بۆیە بەناچاریی دەبێ پەنا بەرنە بەر هەڵبژاردن.

3) پاشان ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەر ﷺ بكەین، دەبینین ئەویش هەر وایكردوە، بۆ وێنە: لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا كە حەفتاو پێنج كەس لە یەسریبییەكان بەشدار بوون، پەیمانیان بە پێغەمبەر ﷺدا، كە وەكو حوكمڕانو برا گەورەیان بچێ بۆ مەدینە، حەفتاو سێ پیاوو دوو ئافرەت بوون، جا دوای ئەوە كە بەڵێنو پەیمانی پێ دەدەن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:[1] **{أَخرجوا اليَّ منكم اثني عشر نقيباً ليكونوا على قومهم بما فيهم}**، واتە: لەنێو خۆتاندا دوانزە نوێنەر (نەقیب)م بۆ هەڵبژێرن، بۆئەوەی كە ئەوان سەرپەرشتیاری قەومەكەیان بن، واتە ئەو دوانزە كەسە هەر كامێكیان سەرپەرشتیاری تیرەیەك، یان كۆمەڵێك لەو خەڵكە دەكا

1) رواه الطبراني في الكبير، والذهبي في تأريخ الاسلام، وابن سيد الناس في عُيون الأثر، بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام، ج1، ص(229–228).

